# د. عەلی وەردی

# بەم شێوە "قورەتلعەین"یان کوشت



وەرگێرانی: ئەرسەلان ئەردەلانی

چاپی یەکەم
2011

# بەم شێوە

# "قورەتلعەین" یان گوشت

نوسینی: د. عەلی وەردی

وەرگێڕانی: ئەرسەلان ئەردەلانی

چاپی یەکەم

2011

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە 2 3 3



## ناسنامەی کتێب



**بەم شێوە "قورەتلعەین" یان گوشت**




- **نوسینی**: د. عەلی وەردی
- **وەرگێڕانی**: ئەرسەلان ئەردەڵانی
- **بابەت**: مێژوویی
- **نەخشەسازی و بەرگ**: فواد کەولۆسی
- **تیراژ**: 1000
- **نۆبەت و ساڵی چاپ**: یەکەم ، 2011
- **شوێنی چاپ**: چاپخانەی گەنج

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (07701574293) (07501191847)

د. عەلی وەردی (1913 – 1996)، لە زانكۆی ئەمریكی لە بەیروت خوێندویەتی‌و ماستەرو دكتۆرای لە كۆمەڵناسیدا لە زانكۆی تكساس بەدەستهێناوە. لە ساڵی 1950 لە زانكۆی بەغدا وانەی كۆمەڵناسی وتەوە هەتاكو لە ساڵی 1970 خانەنشینكرا. لە گرنگترین كتێبەكانی: **هێزە كاراكانی ئەست، واعیزەكانی سوڵتان، گاڵتەجارییەتی ئەقڵی مرۆیی، ئەفسانەی ئەدەبی باڵا، ئیبن خەلدون لەژێر تیشكی شارستانیەت‌و كەسایەتیدا، چەند تێڕوانینێكی كۆمەڵایەتی دەربارەی مێژووی نوێی عێراق (هەشت بەرگ)**. سانسۆری حكومەت نەیهێشت بەرگەكانی تری چاپ بكات. هەندێ لە بەرهەمەكانی وەرگێڕدرایە سەر چەندین زمانی جیهانی وەك ئەڵمانی‌و ئیسپانی‌و ئینگلیزی.

## قورەتلعەین

کۆمەڵگای عیراقی لە دوایین ساڵانی ویلایەتەکەی نەجیب پاشادا سەرقاڵی قسەوباسی ئافرەتێکی سەیربون کە پێی دەوترا "قرةالعین". چونکە ئەم ئافرەتە روخساری خۆی حستەڕو، چووە سەر دوانگەو، گوتاری داو سشومڕی نایەوە، ئەمەش یەکەمین ڕوداوە لەو جۆرە کە لە مێژوی عیرقدا ڕوبدات، ڕەنگە نەک تەنها مێژوی عیراق، بەڵکو لە مێژوی تەواوی ڕۆژهەڵاتدا یەکەمین ڕوداوی لەو جۆرە بوبێت. ئێمەش کە ئێستا دەمانەوێت خوێندنەوە بۆ مێژوی کۆمەڵگای عیراقی ئەو سەردەمە بکەین پێویستە کەسایەتی ئەو ئافرەتە بناسین‌و بزانین تاچەند کاریگەری هەبوە بۆ سەر عیراق‌و پاشان ئێران.

ئەم ئافرەتە لە ساڵی 1814ز لە قەزوین لەدایکبوە، ناونرا "زەرین تاج" کە ئەمەش ناوێکی فارسییەو بە مانای "گولینەی ئالتونی" دێت چونکە ڕەنگی قژی خەنەیی بوە، خانەوادەکەی یەکێک بوە لە خانەوادە ئاینیە ناودارەکانی قەزوین کە خاوەن ڕێو شوێنی تایبەت بون لە نێو

خەڵکیدا، بەم خانەوادەیە دەوترا "خێڵی بورغانی"، لە نێو ئەم خێڵەدا چەندان زانای ئاینی بەتوانای تیاهەڵکەوت. یەکێ لەوانە "مەلا محەمەد صالح" بو کە باوکی قورەتلعەین بو، هەروەها "مەلا محەمەد تەقی"ش کە یەکێ بو لە مامەکانی. ئەم مەلا محەمەد تەقییە لەو سەردەمەدا گەورە زانای ئاینی قەزوین بو.

قورەتلعەین بە جوانییەکی بێ وێنەو زیرەکییەکی لەڕادە بەدەر ناسرابو، هەر لە منداڵییەوە هەڵکەوتوبو. دەوترێ لەو وانەبێژیانەی باوکیو مامەیدا بەشداریکردوە کە ئەوان بە فێرخوازانیان دەوتەوە، پەردەیان بۆ دادەناو لە پشتی پەردەوە گوێی دەگرت، بەیتا بەیتا وەهای پێهات بەشداری لە مشتومڕی ئاخاوتنیو فقهییەکانی نێو خێزانەکەی دەکرد، زۆرجار باوکی داخی خۆیی دەردەبڕیو دەیوت: "ئەگەر کوڕ بوایە ئەوا ماڵو وەچاخی ڕۆشن دەکردەوەو جێی منی دەگرتەوە". "عبدالوهاب"ی برای پیاهەڵدانی بۆ زیرەکیە لەڕادە بەدەرەکەی کردوەو وتویەتی: "ئێمە بە تەواوی براو ئامۆزاکانمانەوە نەماندەتوانی لە ئامادەبونی ئەودا قسەبکەین چونکە زانستەکەی تۆقاندبوینی، ئەگەر بەڕێکەوت باسی پرسێکمان بکردبایە ئیدی ئەو بە ڕونیو زۆر بە لێهاتوی قسەی لەسەر دەکرد تارادەیەك کە بۆمان دەردەکەوت ئێمە هەڵەیینو بە تیامانەوە بەجێمان دەهێشت"[1].

---

[1] محەمەد زەکی: "دەستپێکی بونەکیەکان"، وەرگێڕانی عبدالجلیل سعد – قاهیرە 1940، لاپەڕەی 63 – 66

خەلکی قەزوین لەو سەردەمەدا وەک خەلکی کەربەللا بوبون بە دوو بەشی ناکۆکەوە: "پشت سەری"و "بالاسەری" واتە شێخەکان‌و دژە شێخەکان. ئەم دوکەرتبونە ڕۆچوبوە نێو مالی قورەتلعەینەوە، ئەوەبو مامە گەورەی مەلا محەمەدی تەقی لە دژە شێخەکان بو، لە کاتێکدا مامەکەی تری کە ناوی مەلا عەلی بو لە شێخەکان بو. قورەتلعەین لەم کەشە هزرییە بۆڵەبۆڵئامێزەدا پەروەردەبو، گومان لەوەدا نییە کە ئەو بە زیرەکی خۆی توانیویەتی هۆش بە زۆر شت بێنێت‌و لە نێو ئەو ململانێیەدا سودی لێوەربگرێت.

کاتێک قورەتلعەین گەیشتە تەمەنی چواردە سالی بەشو درایە کوڕی مامی واتە مەلا مەحەمەدی کوڕی مەلا مەحەمەد تەقی، زۆر بەسەر هاوسەرگیریاندا تێنەپەڕیبو کاتێک مێردەکەی بڕیاریدا کۆچ بکات بۆ عێراق بە مەبەستی فێرخوازی، بۆیە پێکەوە سەفەریانکرد بۆ کەربەللاو لە خانویەکدا نیشتەجێبون کە دەگەڕێتەوە بۆ خانەوادەکەیان‌و دەکەوێتە گەڕەکی "خیمگاه" کە تائێستاش ماوەو هەندێ کەس لە خانەوادەی بورغانی تێدا نیشتەجێیە، نوسەری ئەم ڕستانە لە ماوەی پێشودا سەردانی کردوە.

ئەم ژن‌و مێردە بۆ ماوەی سیانزە سال لە کەربەللا مانەوەو لەوێ بونە خاوەنی دوو کوڕ کە ناویان ئیبراهیم‌و ئیسماعیل بو، وادیارە کە ژیانیان لە کەربەللا بێبەش نەبو لە ناکۆکی‌و ململانێ، چونکە قورەتلعەین مەیلی بەلای سەید کازم ڕەشتیدا دەچو کە لەو سەردەمەدا سەرخێلی

شێخەکان بو، لە کاتێکدا مێردەکەی مەیلی بەلای "بالاسەری"ـدا دەچو. ڕەنگە لە سەرەتادا ناکۆکی‌و دژیاری نێوان ئەم دوو هاوسەرە ئاسان بوبێت پاشان لە گەڵ تێپەڕبونی ڕۆژگاردا توندبوبێت.

لە ساڵی 1841ز ئەم دوو هاوسەرە گەڕانەوە بۆ قەزوین، لەوێش کوڕێکی تریان بو کە ناویاننا "ئیسحاق"، گەڕانەوەیان بۆ قەزوین سەرەتایەك بو بۆ دوبارە دەستپێکردنەوەی ناکۆکیەکانیان. چونکە باوکی مێردەکەی فەتوایەکی دەرکردو تێیدا شێخەکانی بە کافر لەقەڵەمدا لە کاتێکدا قورەتلعەین زیاتر لە جاران شەیدای بیروباوەڕی شێخەکان‌و هۆگری سەید کازم ڕوشتی بوبو.

قورەتلعەین بەردەوام نامەی بۆ ڕوشتی دەناردو پرسی پێدەکرد لە بارەی چەند مانایەکی پەنهانی نێو نوسینەکانیەوە، پاشان دواجار بڕیاری دا مێردەکەی‌و منداڵەکانی بەجێبهێڵێت‌و کۆچ بکات بەرەوە کەربەلا تاکو لە ڕوشتی بەوە نزیك بێت‌و بەشداری لە حەوزە زانستیەکەیدا بکات.

لە ساڵی 1843ز قورەتلعەین سەفەری کرد بۆ کەربەلا، ئەوکات لە تەمەنی بیست‌و نۆ ساڵیدا بو وە لە لوتکەی پێگەیشتنیدابو، کاتێکیش کە گەیشتە کەربەلا سەرسام بو بەوەی ئەو ڕوشتیەی کە ئەو هاتوە بۆ لای بەر لە چەند ڕۆژێك مردوە بۆیە تومشی نائومێدی بو وە بەشداری لە پرسەکەیدا کرد[1].

---

[1] ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی قورەتلعەینەوەیە لە چەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە وەدەستم کەوتوە، وەلێ بەشێوەیەکی تایبەت سودم لە کتێبێکی دەستنوس وەرگرتوە کە بە پێنوسی عبود صالح نوسراوە بە ناونیشانی

## لەئامێزانی بانگهێشتی بابی

گۆی سەرچاوە بابی‌و بەهائیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە قورەتلعەین لە یەکەمین ئەو کەسانەیە کە بانگهێشتی بابییان لەئامێزناوەو بودتە یەکێ لە هەژدە "بیتە زیندووەکان"، هەموویان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە قورەتلعەین کاتێك چونە سەر ڕێبازی بابی کە هێشتا باب لە شیراز بە نهێنی بانگەشەی بۆ خۆی دەکرد. ئەمەش شتێکە زەحمەتە وێنای بکەین، چونکە قورەتلعەین چۆن توانی بە بانگهێشتەکە بزانێت لە کاتێکدا ئەو لە کەربەلایە وە چۆن توانی پەیوەندی بە بابەوە بکات‌و شتێکی لەبارەوە بزانێت.

سەرچاوە بەهائیەکان لەم بارەوە دوو چیرۆکی جیاواز لەیەکتر دەگێڕنەوە، یەکێ لەو سەرچاوانە کە کتێبی "تذكرة الأوفياء"ـە تێیدا هاتوە دەڵێت: قورەتلعەین لەدوای مردنی سەید کازم ڕوشتی کاتێك گەیشتە کەربەلا لە هەمو شتێك دابڕاو دەستی دایە نوێژکردن‌و پاڕانەوە لە چاوەڕوانی ئەو کەسە بەڵێندراوەی کە ڕوشتی پێشگۆیی نزیکبونەوەی

"قورەتلعەین لە ڕاستی‌و واقعیدا"، ئەوەی کە لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە کە نوسەری ئەو کتێبە لە خانەوادەی بورغانییە‌و خزمی نزیکی قورەتلعەینە.

هانی دەکرد، شەوێکیان لە خەویدا گەنجێکی ڕەشپۆشی مێزەر سەوزی بە ئاسمانەوە بینیوە دەستی بۆ پاڕانەوە بەرزکردووەو هەندێ ئایەت دەخوێنێ، پاش ساوەیەك ڕاقەی سورەتی یوسفی لە بابەوە پێنگەشتوە دەبینێت یەکێ لەو ئایەتانەی کە گەنجی نێو خەوەکەی دەیخوێند لە ڕاڤەکەدایە، ئەمەش وەها لێنکردوە باوەڕ بە بانگەێشتی باب بهێنێت[1].

بەڵام کتێبی "الكواكب الدرية" چیرۆکەکە بە شێوەیەکی تر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە کاتێکدا کە فێرخوازەکانی سەید کازم ڕوشتی بە نێو وڵاتدا بڵاوەیانکردبو بەشوێن کەسی چاوەڕوانکراودا دەگەڕان، قورەتلعەین خۆی لە هەمو شتێك دابڕی بو بۆ وەرزشو لێبڕانو دەستی لە خۆراکیش هەڵگرتبو، هەمو کاتێکیشی لە چاوەڕوانیو تێڕامانا بەسەر دەبرد. ڕۆژێك نامەیەك بۆ مەلا حسێن بەشروئی دەنوسێتو تێیدا دەڵێت: "ئەگەر کەسی چاوەڕوانکراوتان بینی بێبەشم مەکەن لەو هەواڵە، خۆشگوزەرانیم لێ گل مەدەنەوە، ئەم زەمینەش پشکێکی دەکەوێت لە جامی شکۆمەندی". نامەکە گەیشتە دەستی مەلا حسێن لەکاتێکدا کە لە شیراز بو بۆیە نامەکەی نیشان باب دا، بۆیە باب ناوی قورەتلعەینی خستە نێو ڕیزی "پیتە زیندوەکان"ـەوەو واژوی لەسەر کرد. کاتێکیش مەلا عەلی بسطامی وەك نوێنەری باب هات بۆ عێراق قورەتلعەین پەیوەندی پێوەکردو ڕۆچوە ناو وردەکاری بانگهێشتەکەوە کە ئەمەش وەهای لێکرد هێندەیتر باوەڕی پێبێنێت[2].

---

[1] محەمەد زەردی، سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 64.

[2] عەبدالحمید ئاوارە: "الكواكب الدرية"، وەرگێڕانی ئەحمەد فائق ڕەشید – قاهیرە، 1924، بەشی یەکەم، لاپەڕە 110 – 111

## قۆناغی یەکەم

خواناسەکان وانیشانی ئەدەن کە بانگهێشتی بابی پەیتا پەیتا لە کەربەللا شوێنکەوتەی پەیدا کردوە، هەموشیان لە شێخەکان بون، وەلێ هەمو شتێکیان بەنهێنیو بە بێدەنگ دەکردو لە بەردەم خەلکیدا ڕێبازە نوێکەیان جاڕنەئەدا، تەنانەت لە سەرەتادا بۆیان نەبو ناوی باب بهێنن یاخود کەسایەتیەکەی دەستنیشان بکەن بەلکو بە هێماو ئاماژە لە بارەیەوە ئەدوان، زۆرجار لەکاتی قسەکردندا بە ناوی "الذکر" ناویان دەبرد.

وادیارە کە قورەتلعەین کاتێك چوەتە سەر ڕێبازی بابی بە چەشنی شوێنکەواتنی تری بانگهێشتەکە پابەندبوە بە نهێنی پارێزی بانگهێشتەکەوە، بەلام بە شێوەیەکی چالاك پەیوەندی بە خەلکەوە کردوە تاکو ڕێگاخۆش بکات لەبۆ قبولکردنی ئەو ڕێبازە نوێیە. دەوترێ گوایە ئەو لەو قۆناغەی ژیانیدا لە مالەکەی خۆیدا وانەی ئاینی وتوەتەوەو ژمارەیەکی زۆر فێرخوازو گوێگر لە مالەکەیدا کۆبونەتەوە، لە ژورێکی بچوکداو لە پشتی دەرگایەکەوە کە بە پەردەیەك داپۆشراوە دادەنیشت،

فێرخوازو گوێگرانیش لە ژوورێکی فراوانداو بەرامبەر بە ژوورەکەی ئەو دادەنیشتن، ئەویش لە پشتی پەردەوە قسەی بۆ دەکردن.

قورەتلعەین خاوەنی دەنگێکی زوڵاڵ بو و توانایەکی گەورەی هەبو بۆ قسەکردن و گفتوگۆ، بەمەش لە کۆمەڵگای کەربەلاویدا جولەو لەرزەیەکی مەزنی نایەوەو ناوی کەوتە سەر هەمو زمانێك، ژنان و پیاوان کەوتنە ششتومڕی ئەو بەرزکە نوێیانەی کە قورەتلعەین لە وانە ماڵیەکانیدا دەیخستنەڕو.

لە مانگی نابی ساڵی 1846ز، قورەتلعەین خۆی و شوێنکەوتوانی ڕۆشتن بەرەو کاظمیە، دەوترێ هۆکاری ئەو ڕۆشتنەیان دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکی نێوان قورەتلعەین و میرزا محەمەد حەسەن جەوهەر کە سەرگەورەی شێخەکان بو، بۆیە بڕیاریدا لێی دوربکەوێتەوەو بڕوات بۆ شارێکی تر کە تێیدا بتوانێت تەنیابێت و کەسێکی نارازی لێنەبێت کە سامی لێبکات.

قورەتلعەین لە کاظمیە پێشوازییەکی گەورەی لێکرا کە لە ڕیزی پێشی پێشوازیکەرانەوە کوڕەکانی سەید عبداللە شبر بو، هەر بۆیە سەرەتا بوە میوانی ئەوان، پاشان ڕۆشت بۆ ماڵی سەید صادقی کەشفی کە یەکێکە لە خزمەتکارە بەخشندەکان و خانوەکەی تەرخانکردبو بۆ حەوانەوەی میوانە شێخەکان.

قورەتلعەین لە کاظمیە دەستیکردەوە بە وانەبێژی هەر بەو چەشنەی کە لە کەربەلا خەریکی بو، بەدەر لەوەش هەندێ جار دەچوە سەر دوانگەو گوێگرانی بە بەهانەو جوانبێژی وتارەکەی سەرسام دەرکرد.

ناوبانگی لە بەغدا بڵاوبووەوە، زۆربەی دانیشتوانی بە شنعەو ئەوانی تریشەوە دەهاتن بۆ گوێگرتن لە وانەو کۆڕەکانی. یەکێ لەو پیرەپیاوانەی خەڵکی کازمیە شتێکی بۆ گێڕاصەوە کە ڕاستەوخۆ لە کەسێکی بیستبو کە قورەتلعەینی بینیبو لە کاتی نشتەجێبونیدا لە کازمیە، وتی: زۆربەك خەڵك بەشداری لە زنجیرە کۆڕەکانیداکردو لە دوایەوە نوێژیان دەکرد، کاتێك کە گوێیان لێی دەبو قسەی دەکرد هێندە پێی کاریگەر بون واقیانوڕدەما.

رادیارە قورەتلعەین لە پەچەو حیجابدا بەو ڕەوتە توندە نەیگرتبوە بەر کە ژنانی هاوچەرخی خۆی لەو سەردەمەدا پێی ڕاهاتبون، پێدەچێ ئەو پابەندبوبێت بەو ڕوحەڵماڵییەی کە شەریعەی ئیسلام ڕێی پێدەدات کە ئەویش دەرخستنی دەستو ڕوخسارە بەبێ ڕازاندنەوە، لە تەنیشت ئەو هاوڕێیانەیدا دادەنیشت کە متمانەی پێیانبو، ڕوخساری ئاشکرا دەکردو قسەی لەگەڵ دەکردن، بەڵام ئەم جۆرە ڕوحەڵماڵیتە لەو ڕۆژگارەدا لەلای خەڵکی ئەرمەڕدو نەبو بۆیە دەنگۆو ژاوەژاوەی لە نێو خەڵكو پیاوانی ئاینیدا ئایەوەو قسەیان بۆ هەڵدەبەستو تاوانی خراپیان دەخستەپاڵ.

لەو ڕۆژگارەدا خەڵك داوێن پاکی ئافرەتیان بە پەچەوە دەبەست، ئیدی هەتا چەند زیاتر پەچەکەی توندوتۆڵ بوایە ئەوا لە بەرچاوی ئەوان داوێن پاکترینو کاملترین کەس دەبو. بۆیە نەیارانی قورەتلعەین تاوانی ڕەوشتیان دەخستەپاڵی کە هەتا ئەمڕۆش ئەو تاوانانەی پێوە لکاوە.

جارێکیان لە یەکێ لە پیرەپیاوانی کازمیەم پرسی کە ئایا دەیناسێت یان نا، پیاوەکە هێشتا بە تەواوی گوێی لە پرسیارەکەم نەبو کەچی لەپڕ

سەرسامیانکردم، وەڵامی دامەوەو وتی ئەو "رەهابوەو رەهای کردوە" و شتانێکی وت کە شایەنی باسکردن نییە. ئەم وەڵامەش مایەی سەرسامی نییە لە کەسێکەوە دەرچێت کە لە ژینگەی بەچەی توندوتۆڵدا ژیابێت‌و بە شێوەیەکی رەها باوەری پێی بوبێت.

خاوەنی کتێبی "الكواكب الدرية" دەڵێت: رووخەڵسالیینی قورەتلعەین بەرامبەر بە هاورێو فێرخوازەکانی جیاوازییەکی دروستکردبو لە نێوان پیاوانی ئاینیداو مشتومرو بۆڵەبۆڵێکی گەورەی لە نێوانیاندا نابوەوە، کاتێکیش کە لەو بارەوە لە فێرخوازانیان پرسی وتیان دەست‌و روخسار لە تێروانینی ئاینی ئیسلامەوە ئەندامی شەرم نەبوە. بەڵگەشیان لەسەر حەج هێناوەتەوە کە تێیدا ژنەکانی پێغەمبەر روخسارو دەستیان دانەپۆشیوە سەرباری ئەو قەرەباڵخییەی کە لە وەرزی حەجدا هەبوە، بەڵام ئەم وەڵامە بەڵگەدارە کۆتایی بە کێشەکە نەهێنا بەڵکو جیاوازی‌و بۆڵەبۆڵی لەنێو خەڵکیدا نایەوە[1].

---

[1] سەرچاوەی پێشو، لاپەرە 189.

## قۆناغی دووەم

قورەتلعەین بۆ ماوەی شەش مانگ لە کازمیە مایەوە، پاشان لە مانگی شوباتی سالی 1847ـدا بە بۆنەی چلەوە گەڕایەوە بۆ کەربەلا کە دەکەوتە هەشتی ئەو مانگە. بە گەڕانەوەی بۆ کەربەلا پێی نایە قۆناغێکی نوێ لە ژیانیدا، چونکە ڕێگەی شاردنەوەو بەنهێنی ڕاگرتنی بانگهێشتەکەی وەلاناو ئەمجارەیان بەئاشکراو بە دەنگێکی زوڵاڵەوە بانگهێشتەکەی جاڕنەدا، ئەمەش بوە هۆکارێك بۆ دروستبونی دوکەرتی لە نێوان بابیەکاندا، چونکە گروهێکیان شوێنی کەوتن کە پێیان دەوترا "القرتیە" یەکێ لەوانە مەلا باقر بو کە یەکێ بو لەوانەی هەر لە سەرەتاوە چو بەدەم بانگهێشتی بابیەوەو باب بە پێنوسەکەی خۆی پیاهەڵدانی بۆ کرد. نەیارەکانیشی شوێن مەلا ئەحمەد خوراسانی کەوتن کە مالی سەید کازم ڕوشتی بەخێو دەکاتو بەرپرسە لە بێوەژنەکەی.

نوسەری ئەم ڕستانە دوو کتێبی دۆزیەوە کە زۆر بە باشی وێنای ئەو دوکەرتبونە دەکەن کە لە کەربەلا ڕویدا، ئەو دوو کتێبەش یەکتر تەواو

دەکەن، یان بە واتایەکی وردتر بڵێین: یەکتر ڕەتدەکەنەوە. یەکەمیان کتێبێکی دەستنوسە بە ناوی "بەروبادرە شێخیەکان" کە بە زمان‌و شێوەزارێکی خۆماڵی نوسراوەتەوە بە پێنوسی مەلا ئەحمەد خوراسانی کە تێیدا ڕەخنە لە قورەتلعەین دەگرێت‌و حمێتی پێدەدات‌و ناوی دەنێت "بەد کچ" (بنت طالح). کتێبی دووەمیش بە پێنوسی یەکێ لە شوێنکەوتوانی قورەتلعەینە کە ناوی شێخ سوڵتان کەربەلایی بەو تێیدا وەڵامی مەلا ئەحمەد خوراسانی ئەداتەوەو بەرگری لە قورەتلعەین دەکات[1].

کاتێك کە ئەم دوو کتێبە بە وردی دەخوێنینەوەو بەراورد لەنێوانیاندا دەکەین، دەتوانین خاڵە ناکۆك‌و جیاوازەکانی نێوان شوێنکەوتوانی قورەتلعەین‌و شوێنکەوتوانی مەلا ئەحمەد بدۆزینەوە. ئەویش بە کورتی ئەمانەی خوارەوەیە:

1- قورەتلعەین پێیوابو کە کاتی ئەوە هاتوە پەردە لەسەر ئەو بانگهێشتنە هەڵماڵرێت‌و بە دەنگێکی زوڵاڵ بانگەشەی بۆ بکرێت، بەڵام مەلا ئەحمەد پێیوابو کە باب وا فەرمانی پێکردوە کە بانگهێشتەکە بەنهێنی بپارێزن.

2- مەلا ئەحمەد کتێبەکانی شێخ ئەحمەد الاحسائی‌و سەید کازم ڕوشتی بە ئەمر دادەنا، وە بەردەوام دەخوێندنەوە، بەڵام قورەتلعەین‌و شوێنکەوتوانی ئەو کتێبانە بە کۆپیکراو دادەنێن‌و

---

[1] سوپاس عمرو صافی دەکەم لە کەربەلاوە کە کتێبی یەکەمیانی بە خواستن پێدام، هەروەها سوپاسی عبدالرزاق عبایچی دەکەم لە بەغداوە کە کتێبی دووەمیانی بە خواستن پێدام.

دەڵێن بە هاتنی باب وادەیان بەسەرچوە، بەو جۆرەش تاوانیان دەنایە ملی مەلا ئەحمەدو ڕێگەیان بە خەڵك نەئەدا بەشداری لە کۆڕەکانیدا بکەن‌و واناویان دەنا کە ئەو مردو خۆرە، مەبەستیشیان لەوە ئەوەبو کە ئەو کتێبی کەسانێکی مردوی دەخوێندەوە.

3- لە تێڕوانینی قورەتلعەینەوە مەبەست لە سەرهەڵدانی "ئیمامی ونبو" سەرهەڵدانی "باب"ـە، گەڕانەوەی ئیمامەکانیش مەبەست لێی سەرهەڵدانی ئەو کەسانەیە کە لە سەرەتادا دەچنە سەر ڕێبازی بانگهێشتەکە واتە ئەوانەی بەر لە هەموان بانگهێشتی بابی لەئامێز دەگرن: مەلا حسێن بەشرویی لە جێگەی پێغەمبەری خوایە (رسول الله)، مەلا عەلی بسطامی ـش لە جێگەی میری باوەڕدارانە (امیر المؤمنین)، قورەتلعەینیش لە جێگەی فاتیمە زەهرایە (فاطمة الزهراء)، مەلا حەسەن سجستانی ـش لە جێی ئیمامی حەسەنە، سەید حسێنی یەزدی ـش لە جێی ئیمامی حسێنە، مەلا باقریش لە جێی ئیمامی باقرە... هتد. مەلا ئەحمەد هەمو ئەم شتانەی دەخستە پاڵ قورەتلعەین کە گوایە ئەو پێیوایە ئەو کەسانە بەو جۆرەن، لەکاتێکدا ئەوان ئەو قسانەیان ڕەتدەکردەوە.

4- مەلا ئەحمەد ئەوەی دەخستە پاڵ قورەتلعەین کە گوایە ئەو ڕێگری دەکات لە سازدانی پرسە بۆ ئیمامی حسێن یان

سەردانیکردنی گۆڕی ئیمامەکان بە بیانوی ئەوەی کە ناکرێ خەسڵەتی مرۆیی بخەینە پاڵ ئیمامەکان وەك ئینوییو مردن، کەواتە هیچ مانایەك نامێنێت بۆ یادکردنەوەی ئینویەتی حسێن یان مردنی.

5- قورەتلعەینو هاوەڵانی جگەرەکێشانیان حەرام دەکردو وایان دادەنا کە ئەرە یەکێکە لەو فێرکاریە نوێیانەی کە باب هێناویەتی، بەڵام مەلا ئەحمەد جگەرەی دەکێشاو وەهای نیشان ئەدا کە بۆ بەنهێنی پاراستنی بانگهێشتەکە ئەم کارە دەکات.

بۆ ئەوەی خوێنەر ئەو ستایلو شێوازە تێبگات کە مەلا ئەحمەد کتێبەکەی پێنوسیوەتەوەو ڕای خۆیی سەبارەت بە قورەتلعەین پێ دەربڕیوە کورتەیەکتان لە کتێبە بۆ دەخەینەڕو بێ هیچ لابردنو زیادکارییەك تەنها دانانی هەندێ فاریزە نەبێت لەگەڵ هەندێ ڕاڤەدا کە وەك باوە دەیخەینە نێو دوو داشەوە. مەلا ئەحمەد دەڵێت:

"بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد الله الذي خلق الخلق ليحسنوا عملاً باتباع الصالحين... ئەی ڕەوادۆستانی تێکۆشەرانی چاکەکاران، ئەی ئەوانەی خوا بەڵێنی هەقی دڵنیایی پێداون، بێدەنگ بنو گوێ بگرن بۆ ئەو شتانەی کە منێکی ڕسوای هەژار باسی دەکەم، منێك کە گیرۆدەم بە دەستی جیاوازی نێوان خێڵی زیندانیانو عەلییەکان، من ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیل خوراسانیمو قوتابی سەیدێکی مەزنم کە یەکێکە لە پیاوچاکان...

بزانن ڕێبازەکانی ئەمڕۆ جیاوازن، هەندێکیان ئەهلی سوننەتو جەماعەتن و هەندێکیشیان شیعەن کە بەخۆیان دەڵێن "جەعفەری دوانزە ئیمامی" (جعفرية الاثنا عشرية)، ئەوانیش دوو گروهن کە پێکدێن لە بالاسەریو شێخەکان، شێخەکانیش دوو دەستەن کە پێکهاتوون لە بابیەکانو ئەوانی تر، بابیەکانیش ئێستا بوونەتە دوو تیم هەندێکیان ئەوانەن کە کەوتنە شوێن کچی صالح قەزوینی کە نکوڵی لە شێخی میهرەبانو سەیدی مەزن کرد –مەبەستی شێخ ئەحمەد الاحسائیو سەید کازم ڕوشتی یە– کچەکەشی نکوڵی لە ناوهێنانی حەکیم کرد –مەبەستی لە بابە– قسەو کردارەکانی ئەوی ساردکردەوەو خۆی خستەپاڵیو شوێن ئارەزوو هەوای خۆی کەوتو چورتمی بەسەر خۆیدا هێنا، دەی ئەفرەت لە بوێریەکەیو گەوردو هاوسێ کەشی...".

پاشان مەلا ئەحمەد باسی ئەوە دەکات کە چۆن نوسراوێك لە بابەوە دەگات کە تێیدا پیاهەڵدان بۆ قورەتلعەین دەکات بەو جۆرە مەلا باقر ئەو نوسراوە دەکاتە بیانویەك بەدەستیەوە بۆ کۆکردنەوەی شوێنەکەوتە لە دەورو پشتی قورەتلعەین. مەلا ئەحمەد دەڵێت: "... بەهەرحاڵ ئەو مەلا باقرە شوێنو پێگەیەکی لەلای ئەو ئافرەتە وەرگرت، مەبەستم لە (ئافرەت) کچەکەی صالحە، پاشان لەدوای چەند ڕۆژێك ئەو نوسراوەی گرت بەدەستەوە کە بۆ کچەکەی صالح هاتبو وە بەنێو خەڵکیو هاوڕێیانیدا دەگەڕاو پێی دەوتن باوەڕ بەم نوسراوە بێنن چونکە لە بارەی قورەتلعەینەوە

هاتوە، ئەو ئەمڕۆ بابە[1] بۆ ئێوە هەروەك چۆن ڕێرداو مەلا حسێن بابە بۆتان، ئەوەی بیخوێنێتەوە ڕزگاری دەبێ‌و ئەوەشی نەیخوێنێتەوە لەناودەچێ. وتم ئەی مەلا باقر ئەم نوسراوە نیشانە بەو شتە نادات کە ئێوە دەتانەوێت، بۆیە لەخۆتانی تێکمەدەن، نە جەنابی قورەتلعەین‌و نە خەڵکی تر کەسیان گوێیان لێنەگرتم، تەنانەت کۆمەڵێك پیاوی هاوڕێی لەلای قورەتلعەین کۆکردەوە بە سەرۆکایەتی شێخ سوڵتان‌و پاشان شێخ صالح کەریمی‌و پاشان میرزا هادی نەهری‌و هەندێ هاوڕێی تر. بەهەرحاڵ وەك پێموتن: ئەی خەڵکینە ئەم نوسراوە نیشانە بەو شتە نادات کە ئەوان دەیانەوێت. گوێیان لێنەگرتم، بەردەوام بون لە ناکۆکی‌و بۆڵەبۆڵ، منیان بە گومڕا لە قەڵەمداو بڕیاریان لەسەردام کە گوایە من وانە نابێژم‌و منداڵ فێرناکەم... قورەتلعەین فەرمانی پێکردن کە هەرشتێك لە زمانی پیرۆزی جەنابی مەلا باقرەوە دێتەدەر ڕاودیەو دەبێ گوێڕایەڵی بن، وەگەر لە مەبەستی تێنەگەشتن ئەوا لە جیهانی دڵەکانتاندا تێدەگەن. ئەوانیش شتانێکی سەیرو سەمەرەیان دەکرد کە نە کەسە سەرەتاییەکان‌و نە کەسە دواییەکان نەیاندەکرد هەتا وەهای پێهات ناکۆکی‌و بۆڵەبۆڵ کەوتە نێوانیانەوە... من کاتێکیش کە یەکەمجار ناکۆکی دروست بو چەندان نوسراوم نوسییەوەو پرسەکانم لە ڕێگەی پرسیارەوە بۆ هەمو لایەنەکان خستەڕو، یەکیانم بۆ جەنابی مەلا شێخ عەلی نارد لە شیراز، ئەویشیان بۆ

---

[1] باب لە عەرەبیدا بە مانای دەرگا دێت لە کوردیدا، لێرەدا ڕەنگە مەبەستی پێیە بڵێت: ئەو ئەمڕۆ دەرگایەکە بۆ ئێوە، ڕەنگیشە مەبەستی خودی باب بێت. وەرگێڕ

جەنابی سەید حسێن لە ئەسفەهان، دانەیەکیش بۆ "الذكر العلي" — مەبەستی لە بابە— دانەیەکی تریش بۆ جەنابی عەلی لە کاظم ﷺ. لەم نوسراوانەشدا قسەی کەس و ناوی کەسم نەهێناوە بەو هیوایەی ڕازی بن گەر وەڵام هاتەوە، ئەوکات وەڵامی "الذكر العلي" سەلامی خوای لێبێ لە گەڵ وەڵامی سەید حسێن هاتەوە دەربارەی وتەو کردارەکانیان... ئەواتیش بەپێی ویستی خۆیان بەدەمەوە هەڵبەستنیان بۆ وەڵامەکانیان دەکردو تەنانەت هیچ شتێك کاریگەری لێنەکردن... لە ڕاستیدا کاتێك ئەو ناکۆکییە کەوتەوە من زۆر پێی نیگەران و خەمبار بوم و ڕۆشتم بۆ لای حەزرەتی حسێن ﷺ داوام لە ئیمام کرد ئەو جیاوازی و ناکۆکیە نەهێڵێت، کاتێکیش کە حەزرەتیم جێهێشت ڕۆشتم بۆ ماڵی میرزا هادی نەهری، ئەوکات لەوێ مەلا باقر هات و نوسراوێکی بەدەستەوە بو کە لەلایەن "الذكر العلي" سەلامی خوای لێبێ نێردرابو تێیدا دەڵێت: مژدە مژدە "الذكر" سلاوی بۆت هەیە، کچەکەی صالحیش تۆی دەوێت. کاتێکیش چوم بۆلای، لەوێ هەندێ هاوڕێی تریش ئامادەبون، وتی: لەلایەکەوە تۆم بۆ ئەوە دەویست کە سلاوی "الذكر"ـت پێڕاگەیەنم چونکە "الذكر" سلاوی خوای لێبێت لە نوسراوێکی سەید عەلی شبردا سلاوی بۆت ناردوە کە ئەمەش دەقی نوسراوەکەیە: (سلاوم بگەیەننە ئەحمەد لە ماڵی کازم). کاتێك خوێندیەوە وتی پێویستە تۆ دوو وانە بڵێیتەوە: یەکیان هی مەلا باقرو شێخ صالح و میرزا هادی و تایبەتمەندی هاوەڵان، ئەوی تریشیان با کتێبی هەر کەسێك بێت کە خۆت دەتەوێت. ئیدی لە کوڕەکە هاتمەدەرو

مژدانەم بەوە ئەدا کە ناکۆکی‌و جیاوازییەکان لەناوچوە، کەچی کاتێك کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە لەدوای دوو ڕۆژ بیستم بەدەمەوە هەڵیەستتیان بۆ نوسراوەکە کردەوەو وتویانە: (ماڵی کازم مەلا عەلی یە، ئەحمەدیش تەنها قسەبێژەو کاری نایەندیە)، بۆیە تێگەیشتم کە ئەوان تەنها مەبەستیان نانەوەی ناکۆکی‌و فیتنەیی یە...".

پاشان مەلا ئەحمەد باسی لەو شتانە دەکات کە دواتر بەسەر قورەتلعەیندا هاتوەو دەڵێت: ".... پاشان لەدوای ئەوەی کە لەناو خەڵکیدا هەواڵەکەی بڵاوبویەوە کە ئەو چ شتێکی کردوە، خەڵکی تێکچون‌و شلەژان‌و بە دادوەریان وت کە ئەو کەسێکی گومرایەوە خەڵکی دەگۆڕێت، بۆیە لە شورا[1] کۆبونەوەو وەهایان بەباش زانی کە بیبەن، بۆیە لەماڵی میرزا هادی نەهری هێرشیان کردە سەری ئەویش هەڵهات بەرەو ماڵی سەید سڵاوی خوای لێبێت —مەبەستی لە سەید کازم ڕەشتی یە— چوە لای ئەوان، کۆمەڵێك هاتن کە لەنێویاندا حاجی مەهدی کمونە بو، لەگەڵ مەلا عبدالجلیل قازی‌و سەید سەعیدی کوڕی سەید سابت، لەماڵی سەیدەوە بردیان‌و لە ماڵی حاجی مەهدی کمونە زیندانیانکرد، بۆ چەند ڕۆژێك لە زینداندابو، ئەو هەواڵەشیان بە دادوەر ڕاگەیاند، لەبەر ئەوەش کەوا ئافرەت بو زۆریان لێنەکردو ئازادیانکرد. لەو ڕۆژانەدا لە ماڵەوە دانیشتبوم هەندێ

---

[1] شورا: شوێنی ڕاوێژکردن. وەرگێڕ

لە هاورێکانی هاتن بۆلامو وتیان کچی طالح[2] تۆی دەوێ، منیش وتم باشەو رۆشتم بۆلایو دانیشتم بینیم هەندێ لە هاورێیانیشی لەوێ دانیشتونو ئەویش قسە دەکات، پێی وتم: دەزانیت تۆم بۆ چییە؟ وتم: نەخێر، وتی: پێشتر لە لایەن ویلایەتەکەی مەلا باقرەوە پەیامێکم بۆهاتو منیش پێمراگەیاندن بەڵام هیچ کەس قبولی نەکرد چواردە کەس نەبێت کە حەوتیان پیاوەو حەوتیان ژنە، ئێستاش پەیامێکی تر رادەگەیەنم، وتم: چییە؟ وتی: دەمەوێت بەهانەکانی "الذكر" —مەبەستی بابە— سڵاوی خوای لێبێت بسەلمێنمو بانگەشەی بۆ بکەمو برۆم بەرەو بەغدا. وتم: بە چ بەڵگەیەك؟ وتی: لە شەش لاوە وەڵامم بۆ هاتوە، منیش بەرپەرچم دایەوەو وتم: من لە شەش لاوە وەڵامم بۆ هاتوە کە ئەم بانگهێشتە بە نهێنی بپارێزین. وتی: تۆ درۆ دەکەیت، وتم: من درۆ ناکەم بەڵکو تۆ درۆ دەکەیت، پاشان وتم: جگە لەوەش ناکرێ قسە لەگەڵ ژنە بیانییەکدا بکرێت[2]. دوای سێ رۆژ هەندێ لە هاورێکانی بە فەرمانی خۆی رۆشتن بۆلای دادوەرو وتیان: ئێمە دەمانەوێت قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەینو بیانوەکانمان بسەلمێنین. دادوەر وتی: دەریانکەن لێرە چونکە ئەمانە دەستبەرداری ئەم دۆسیە نابن. بۆیە دەریانکردن لە کۆڕەکە، پاشان لەدوای

---

[2] طالح: پێچەوانەی صالحە. صالح واتە پیاوچاك، طالح واتە پیاوخراپ. دیارە مەلا ئەحمەد لە رقی خۆیدا بەرامبەر بە قورەتلعەین بە کچی طالح لەبری کچی صالح ناوی دەبات. وەرگێڕ

[2] کاتێك دەڵێت ژنە بیانی رەنگە مەبەستی ئەو راستییە بێت کە قورەتلعەین بە رەچەڵەك فارسەو خەڵکی قەزوینە، عەرەبستیش زیاتر لە جەمیر ئازادیکی تر ئەو شتانە زۆر لە بەرچاو دەگرن، جا بە وشەی "عەجەم"ـدا دیارە کە ئەوان رەچاوی نەتەوەکانی تر ناکەن چونکە مەبەست لە وشەی عەجەم هەمو نەتەوە ناعەرەبەکانن، وشەی عەرەبیش تەنها خۆیان دەگرێتەوە. وەرگێڕ

سێ رۆژ کەوتنە رێ و رۆشتن بەرەو بەغدا، ژنەکان لەگەڵ پیاوە بیانیەکاندا، کچی طاڵح و هاورێ ژن و پیاوەکانی کەوتنەرێ"[3].

## بۆچونەکەی تر:

لەو کاتەدا کە مەلا ئەحمەد لە کتێبەکەیدا بۆچونی خۆیی دەنوسییەوە هاوکات شێخ سوڵتان لە کتێبەکەی تردا بۆچونێکی پێچەوانەی نوسیوەتەوە، ئەو دەڵێت: "یا ذکر الله تعالی شأنك، بسم الله الرحمن الرحیم، لە بەندەیەکی هەژاری رسوارە، کە دان بە کەمو کوری خۆیدا دەنێت، ناوم سوڵتانی کوری خەڵەفی کوری شێخ حەسەن سوڵتانە، ئەی خەڵکی شێعەی شوێنکەوتوانی باب، سڵاو و بەزەیی و بەرەکەتی خواتان لێبێت. برایان ئەوەی کە ئاشکرایەو پێویست بە باسکردن ناکات ئەوەیە کە جیهان لە پێشکەوتندایە، تێگەیشتنیش لە گەشەدایە، خوای گەورەش لە هەمو سات و کاتێکدا تاقیکردوینەتەوە تاکو گومڕاکان لە باوەڕداران جیابکاتەوە"... لە باردی ئەم دۆخە رەختەوە زۆرێك شت دەرچو وە زۆرێك شت ڕویدا، لەم ساڵداو لە مانگی رەمەزانەوە هەتا ئێستا جیاوازییەکی توند لە قسەو کرداری بیروباوەڕو وردەکاریەکاندا هاتە کایەوە. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مەلا ئەحمەد کە خۆی بە موسوڵمانە ڕاستگۆکانی "الذکر" ﷺ دەزانێت و لە ماڵی باب الله سەلامی خوای لێبێ دانیشتوە —مەبەستی لە ماڵی سەید کازم رەشتی یە— کەچی بە کردەوە وەك درۆزن و

---

[3] لە کتێبی دەستنوسی "مقالة الشیخیة"ـەوە وەرگێراوە کە بە پێنوسی مەلا ئەحمەد خوراسانی نوسراوەتەوە، لاپەڕە 3 – 13.

نکوڵیکارەکان هەڵسوکەوتی دەکرد، ئەو کەسانەی کۆدەکردەوە کە پێیان لە زبانیان دەنا، قاوەی بۆ دروست دەکردن‌و فەرمانی پێدەدان کە بە نهێنی‌و ئاشکرا دوکەڵ هەڵمژن. بەم شێوەیە مایەوە هەتا مانگی رەمەزان، ئەوکات لە یەکێ لە شەوەکانی مانگی رەمەزانداو کتومت لە بیست‌و سێی ئەو مانگەدا، رێکەوت لەسەر ئەوەی کە ڕاستگۆیان بەڵێنیان پێدراوە بە شکان، دواتر مەلا ئەحمەد فەرمانی دا غلیان بهێنن —مەبەستی لە نەرگیلەیە— ئەمەش لە کاتێکدابو کە جەنابی مەلا محەمەد باقر ئامادەبو ئەویش کێشانی دوکەڵی لێ یاساغ کردن، بەڵام زۆربەیان گوێیان نەدا، بۆیە جەنابی ئاخوند —مەبەستی لە مەلا باقرە— گلەیی‌و گازندەی ئاراستەی مەلا ئەحمەد کرد، مەلا ئەحمەدیش دەیوت: من ئەم کارە بۆ خۆ پارێزی دەکەم. ئاخوندیش پێی وت: خۆپارێزی لە بێگانە دەکرێ ئێوەش هەموتان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕاستگۆن‌و باوەڕدارن وە هیچ نکوڵیکارێکتان لەگەڵدا نییە، پاشان چ خۆپارێزییەك لە هەڵنەمژینی دوکەڵدا هەیە، یان واتای خۆپارێزی چییە، وە تا چ سنورێك بردەکات، ڕێزگرتن لەم مالە ئەرکە لەسەر هەمو باوەڕدارێك‌و هیچ کەس بۆی نییە لێرەدا دوکەڵ بکێشێت. ئەم هەواڵەش گەیشت بە خاوخێزان —مەبەستی لە بێوەژنەکەی سەید کازم رەشتی یە— هەروەها گەیشت بە قورەتلعەین، ئەوانیش زۆرێك گلەیی‌و گازندەیان بۆ ناردو ئامۆژگاریان کردو وتیان: "ئەمە کردەوەیەکی ناڵەبارەو هەڵەیەکی گەورەیە، ئێوەش لێی بەرپرسیارن، ئێوە لە نێو خودی لەناوچوتاندا هەراسان بون، دوکەڵ‌و قاوە دەخۆنەوە، خۆتان تەرخان نەکردوە

بۆ خواپەرستی، شوێن ڕێبازی خوا نەکەوتون". ئەویش هەر گوێی بۆ نەدەگرتن و بەردەوام جەنابی ئاخوندی تاوانبار دەکردو دەیوت: ئەو بو کە لەلای قورەتلعەین و خاوخێزان ئاشکرای کردم بۆیە چیتر ڕازیم نییە بێتە لام چونکە کەسێکی تێکدەرە. ئیدی هەرکاتێك جەنابی ئاخوند قسەی دەکرد مەلا ئەحمەد بەربەرچی قسەکانی ئەدایەوە تەنانەت ئەگەر لەبارەی ئەو بابەتەشەوە هیچی نەزانیبایە... مەلا ئەحمەد سوربو لەسەر بۆڵەبۆڵ و وەڵامدانەوەی قسەکانی جەنابی ئاخوند هەتا ئەو کاتەی کە هەواڵەکە گەیشت بە جەنابی قورەتلعەین، بۆیە ئەویش پەیامێکی بۆ ناردو تێیدا دەڵێت: ئەرکە لەسەرت کە ڕێزی ئاخوند بگریت و هەمو شتێکی لێ قبوڵ بکەیت چونکە ئەو لە باوەڕدارە یەکەمینەکانی ئەم ڕێبازەیەو هیچ شتێك بەدەر لە هەق ناڵێت، بەڵام مەلا ئەحمەد هیچ لەو قسانەی ئەوی پێ قبوڵ نەبو، بۆیە قورەتلعەیتیش ناردی بەشوێنیداو دادگایی کردو پێی ڕاگەیاند کە هەمو قسەکانی مەلا محەمەد باقر هەق و ڕاستە. وەلێ هەر ئەوی جێدەهێلا دەگەڕایەوە بۆ دۆخی خۆی و بگرە زیاتر لە جاران سەرکەشی و رقەبەرایەتی دەکرد. لە کاتێکدا کە ئەوان لەم دۆخە وتی وتی و بۆڵەبۆڵەدابون چەند نوسراوێکمان بە واژوی "الذكر" ﷺ بۆهات کە بۆ جەنابی قورەتلعەین ناردبوی، قورەتلعەینی ئەو ﷺ[1]، لە نوسراوەکاندا زۆرێك ئاماژەی پایە بەرزو بڵندی تێدایە...[2].

---

[1] قرة العين: واتە گلێنەی چاو، لە دەقە عەرەبییەکەدا نوسراوە "قرة عينه ﷺ" کاتێك کە دەڵێ "عليه السلام" بۆ ئەوەی ناوی بێنێت ئاماژە بە باب ئەدات، قرة العين یش واتە گلێنەی چاو، کەواتە مانای وایە:

دوای ئەوەی کە شێخ سوڵتان قسەکانی "الذکر" -واتە باب- لە بارەی قورەتولعەینەوە باسکرد، زۆرێك پیاهەڵدانی بۆ کرد، وتی: "مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی شتێکیان لە بارەی ئەو دەرخستانەوە بیست، بێ هیچ بەرچاوڕوونیو بەڵگەیەك دەستیاندایە جنێندانو نکوڵییان لە کۆنەکان[3] کردو تانەیان لێدان، لەگەڵماندا کەوتنە بۆڵەبۆڵو مشتومڕەوە، وتیان: هەر کەسێك بچێت بۆ شیراز ئیتر مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو لە کۆنەکانە، وتمان: بەڵێ هەر کەسێك لەو ڕۆژگارەدا بەشوێن ناینزانیدا ڕۆشتبێت کە کۆنەکانی تیا ڕۆشتن ئەوا ئەویش لە کۆنەکانە... مەلا ئەحمەدیش وتی: ئاکرێ لە هەمان پلەو پایەی کۆنەکاندا بێ. وتمان: "الذکر" عليه السلام ناوی ناوێ کۆنەکان ئیدی ئەو کاتەو ئاخو ڕوخساری لەبەرچاو نەگرتوە، قسەکانی ئەویش سەلامی خوای لێبێت گشتییەو بێ جیاوازی هەموویان دەگرێتەوە، ئێمە بۆمان نییە لە خۆمانەوە قسەی ئەو عليه السلام بە ناڕاستەیەکی تردا بەرین، ئەو هەرچییەك بڵێت جێبەجێی دەکەین، پێویستە پابەند بین بە قسەکانی ئەوەوە سەلامی خوای لێبێت وە دەبێت بە ڕاستیو ڕەوایی بیپارێزین... مەلا ئەحمەد وتی: ئەوەی لەوانە بێت کە تۆ باسی دەکەیت -

گلێنەی چاوی باب سەلامی خوای لێبێت. ڕەنگە ئەو نازناوەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوە چونکە قرة العین "گلێنەی چاو" نازناوو ناوی ڕاستەقینەی خۆی فارسییە لە سەرەتای کتێبەکەشدا ئاماژەی پێدراوە ئەویش "زەرین تاج"ـە. وەرگێڕ

(2) لە کتێبی "ظهور الحق"ـەوە وەرگیراوە، ئەم کتێبەش لە ئێران چاپکراوە بێ ئەوەی ئاماژە بە شوێنو ساڵی چاپ درابێت: لاپەڕەی 245 - 247

(3) کۆنەکان: لە دەقە عەرەبییەکەیدا "السابقون" بەکارهاتووە، واتە ئەو کەسانەی کە لە سەرەتاوە چوون بەدەم بانگەشەی بابەوە. وەرگێڕ

واتە لە کۆنەکان بێت— ئەوە بێبەش نییە لە زانست، بەڵام من وادەبینم کە لەوان داناترم. وتمان: ئەم زانستانە پێوەر نین، ڕەوشەکە پەیوەندی بەوەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە زیکاکی ڕەسەنەوە هەیە، پەیوەندی بە خۆشەویستی خواو پێشەنگەکانیەتی، پەیوەندی بەوەوە هەیە کە چۆن بەرەو ڕاستیو دڵی خوا بڕۆیت، بێ پەرەو ئاماژە، بێ زانستو لێکدانەوە.
کاتێکیش کە مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی ئەمەیان لە ئێمە بینی کەوتنە بۆڵەبۆڵەوە، زیاتر لە جاران وتی وتییان کرد، دواتر خۆیان لە ئێمە جیاکردەوەو ڕەهایان لێیات خەڵکیان لێ هان ئەدایو تاوانیان بەدەمانەوە هەڵدەبەست، قسەی پوچو بیروباوەڕی خراپیان دەخستە پاڵمان. خەڵکی دەهاتن بۆ لامان دەیانپشکنینو دەیانوت: مەلا ئەحمەدو گروهەکەی دەڵێن گوایە ئێوە پێتانوایە "الذكر" ﷺ خوایەکی بێ خوایە، هەروەها وتوتانە کە یەکەم کەس باوەڕی پێهێناوە واتە جەنابی ئاخوند مەلا حسێن سەلامی خوای لێبێت محەمەدی کوڕی عبداللە یە (پێغەمبەر)، دووەم باوەڕداریش جەنابی مەلا عەلی —مەبەستی لە بسطامی یە— عەلی کوڕی ابي طالبە، قورەتلعەینیش سەلامی خوای لێبێت فاطمە یە، هەروەها وتوشتانە کە یانزە کەسە کۆنەکە ئیمامەکانن ﷺ، وە گوایە شێخو سەید لە پاشماوەی لەشی کەسە کۆنەکان دروستبون. کاتێك کە ئەم هەڵبەستو بوختانو درۆیانەمان بیست زانیمان کە ئەوان دەیانەوێت گەندڵی بنێنەوە، بۆیە شەوێکیان لە ماڵی بابی پێشەنگی خوا ﷺ کۆمانکردنەوە تاکو ئەم کارە تێکدەرانەیان چاك بکەینەوەو خۆمان لەو قسانەی ئەوان پاك بکەینەوە،

ئەوانیش بریتی بون لە: مەلا ئەحمەدو، مەلاحسێن کە خزمەتکاربو لەو ماڵە، لەگەڵ سەید کەریمو، سەید عەلی خوراسانیو، حاجی صادقو، حاجی عەلی صائغو، هەندێ ئەفامو ڕسوای تری هاوشێوەی ئەوان، وتمان ئەی خەڵکینە ئەگەر دەتانەوێت چەپەڵیو بەدگۆیی لە نێو ئەو کەسانەدا ببینەوە کە بەبێ دەستکەوت باوەڕیان هێناوە، ئەوا تکاتان لێدەکەین فیتنەیی مەنێنەوە چونکە لە کوشتن خراپترە، ئێمە ئەمشەو بۆیە کۆمانکردونەتەوە تاکو ئەو جیاوازیو ناکۆکیە نەهێڵین، وە خۆمان بێتاوان بکەین لەو تاوانانەی خستوتانەتە پاڵمان، ئێمە دەمانەوێت لەدوای هەڵساغان لەم کۆڕە چیتر بێدەنگ بینو ئەو فیتنەییە بسڕینەوە. بەڵام چەند ڕۆژێکی کەم تێپەڕیبو، کەمتر لە هەفتەیەك، لە نێو هاوڕێکانیدا دەرنوفیو وتی: نوسراوێکم لە "الذکر" ﷺ بۆ دابەزیوە تێیدا دەڵێت: تۆ باب‌و پەناگەو چاوگی خەڵکیت. هاوڕێکانی کەوتنە هەڵبژاردنی، بەردەوام بانگی دەکردو دەیوت: ئەوەی نەیەت بۆ لامو بەشداری لە وانەکاغدا نەکاتو شوێنم نەکەوێت ئەوا لە گومڕاو هەڵگەڕاوەکانە. ئێمەش لە دڵی خۆماندا وتمان: سبحان الله چ کەسێك بانگەشە بۆ غەیری خوا بکات دەبێتە باب. پاشان داوای لێکردین بەشداری لە وانەکەیدا بکەین ئێمەش ڕازی بوینو چوینە لای، لەوێ نوسراوەکەیان خوێندەوە لە ڕستەیەکیاندا هاتوە کە ﷺ داوای لێکردوە کە بە چاکەوە ئاگای لە خاوخێزانی باب الله بێت...[1].

---

[1] سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 249 – 253.

پاشان شێخ سوڵتان باسی ئەوە دەکات کە چۆن مەلا ئەحمەد ڕەفتاری ناشرین بەرامبەر بە بێوەژنەکەی سەید کازم دەکات کە باب داوای لێکردووە بە چاکە بیپارێزێت، ڕێگەی لێگرتووە کە لەگەڵ قورەتلعەیندا برۆن بۆ حەج، چوونە لای دادوەرەکان بۆ ئەم مەبەستە، کاتێکیش کە بێوەژنەکەی سەیدو قورەتلعەین ئەمە دەبیستن دەریدەکەن و ئەفرەتی لێدەکەن، جگە لەوەی کە ئەو زیاتر لە جاران گومڕا دەبێت و خۆیی و هاوڕێکانی جنێو بە ئەو دوو خاتونە دەفرۆشن و بە قسەی ناشرینەوە لەسەریان ئەدوێن، یەکێ لە هاوڕێکانی بەرامبەر بە قورەتلعەین بوێری ئەوەی هێناوە پێی بڵێت "ئەی خومەیرا"[1]، تەنانەت مەلا ئەحمەد خۆیی پێی دەڵێت: "سوریەکەی گونجاوە لە گەڵ زەردییەکەیدا"، خاتو بێوەژن دەچێت بۆ لای قورەتلعەین تاکو لە خەمی قسەکانی ئەو ستەمکارە کەم بکاتەوە، دواتریش نەخۆش دەکەوێت و ناتوانێت سەردانی حەج بکات[2].

پاشان شێخ سوڵتان ئاماژەی بە پەرەسەندنی تەنگەژەی نێوان ئەوان و مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی دا، وتی: "کاتێکیش کە ئەم پیاوە بینی ئێمە وانەکەیان پێ قبوڵ نییەو وەڵامی نادەینەوە، دەیزانی بەڵێ بۆ نوێژە نوێژەکانی ناکەین، بۆیە چەندان جار خۆی و هاوڕێکانی لێمان کۆدەبونەوەو دەریان دەکردین، ئێمەش دەگەڕاینەوە بۆ لایان و بەو پەڕی ملکەچییەوە داوای لێبوردنمان دەکرد، تەنانەت هەندێکمان دەستی مەلا ئەحمەدی ماچ

[1] خومەیرا: واتە سورۆ، نازناوی یەکێکە لە ژنەکانی پێغەمبەر. وەرگێڕ

[2] سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 253 - 254

دەکرد، هەمو ئەمانەمان لە پێناو ئەوەدا دەکرد کە ملکەچی فەرمانی "الذکر" ﷺ بین، چونکە ئەو فەرمانی کردبو کە ماڵی بابی پێشەنگ ﷺ زیندو بکەینەوەو لەوێ کۆببینەوەو شەو و ڕۆژ ئایەتە شکۆکان بخوێنینەوە، بەڵام بیانوکانیان قبوڵ نەکردین، بە جمێن و نەفرەت لێکردنەوە دەرکراین، فیتنەییان نایەوە، پشتگیرییان لە بەدگۆیی و خراپەکاری دەکرد، چەندان قسەی پڕوپوچیان خستە شوێنمان، گەیاندیانە دوژمنایەتی، بەر ماڵیان پێگرتین، لە هەمو لایەکەوە ڕوبەڕوی جمێن و تانەلێدان دەبوینەوە، مەلا حەسەن جەوهەریان لێ هاندابن، ئیدی ئەویش لە هەمو وتارەکانیداو لە کۆڕی ماڵی میرزادا یان هەر کۆڕێکی تر کە تێیدا دادەنیشت، ڕوی دەکردە ئەو خەلکەو دەیوت: ئەی خەڵکینە ئەو تاقمە ڕێیان ونکردوەو شەریعەتیان تێکداوەو ئاینیان ناشرین کردوە، ئێوەش ئەرکە لەسەرتان ئاینتان بپارێزن و بە هەمو توانایەکتان بەرگری لێبکەن نابێ لەوانیش بێدەنگ بن بەڵکو دەبێ ڕەوش و بیروباوەڕیان لە هەمو کۆڕو کۆمەڵێکدا باس بکەن، تاکو خەڵکی بیانناسن کە چۆنن و خۆیان لێ لادەن،... مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی بەردەوامبون لە نانەوەی فیتنەیی و بێ وچان ئاگرەکەیان خۆش دەکرد، چەندان کتێبی جیاوازیان بەپێی مەزاجی خۆیان نوسییەوە کە هەر یەکیان هەڵگری ناوەڕۆک و ئاماژەی جیاوازبون، هەمو ئەو بەدەمەوە هەڵبەستن و بوختانانەیان تێدا نوسییەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێدان، ناردیان بۆ تەواوی ناوچەو وڵاتەکان، لە گشت ناسۆو بازێڕەکاندا

بڵاویان کردەوە، وەك "نەجەف" و "کاظم" و "سر من رأی"[3] و "بەغدا" و "شیراز" و "ئەسفەهان" و "قەزوین" و "خوراسان" و ناوچەکانی تر، چڕیاندیان بە دڵی هەمو ئەو باوەڕدارانەدا؛ بۆنمونە کەسێکی وەك جەنابی سەید عەلی شبر الکاظمی نوسراوێکی بۆ نوسیوم تیایدا دەڵێت: شتگەلێکی سەیرو قسەگەلێکی سەمەرەمان بیستوە کە بەڕاستی جەرگی دەبڕی و خاوخێزان و منداڵ کۆچ پێدەکات. هەمو ئەم فیتنەییەش سەرچاوەکەی مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی بون"...[4].

---

[3] سر من رأی: شارێکی عێراقە کە ئێستا پێی دەوترێ سامەڕا. وەرگێڕ

[4] سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 256 – 257.

## قورەتلعەین لە بەغدا

قورەتلعەین لە جەسەر ئەو دژایەتیە توندەی کە لەلایەن مەلا ئەحمەدو هاورێکانیەوە لەدژی بەرپاکرا ناچاربو بەوەی کەربەللا بەجێبێلێت، بۆیە لە تەك هاوەڵانی و هەندێ لە ژنو پیاوانی هاورێیدا سەفەری کرد بۆ بەغدا. کاتێکیش گەیشتە بەغدا بە میوانی لەلای یەکێ لە دڵسۆزانی خۆی مایەوە کە خەڵکی ئەو شارەبو ئەویش شێخ محەمەد شبل بو، ئەم پیاوە بە رەسەن خەڵکی کوفەیەو کۆچی کردوە بۆ کاظمیە، پاشان لە ساڵی [illegible] ماڵی گواستەوە بۆ بەغدا، بریکاری سەید کازم رەشتی بو لە بەغدا. بۆیە کاتێك کە دواجار قورەتلعەین بوە میوانی سێ ئەهۆمی بۆ تەرخانکرد کە یەکیان تایبەتکرابو بۆ ئافرەتان، دووەمیشیان بۆ پیاوان، سێیەمیش بۆ کۆڕی وانەبێژی[1].

وادیارە قورەتلعەین بوارێکی بەرفراوانتری هەبو لە بەغدا وەك ئەوەی لە کەربەللا هەیبو، بۆیە لەوێ لە پشتی پەردەوە دانیشت بۆ وتنەوەی وانەکانی خۆی، کەسانێکی زۆریش رویان تێدەکرد، لە زۆربەی وانەکانیدا

[1] عمر صافی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە 21.

بانگەوازی هاتنی ئەو ڕۆژەی دەکرد کە تێیدا شەریعەت نوێ دەکرێتەوەو نەریتەکان پووچەڵ دەکرێنەوە[2]. ڕۆژێك دەچێتە کۆڕێکەوە کە والی نەجیب پاشاو موفتی ابو الثناء الآلوسي لێدەبێت ئەویش بە زمانێکی ڕەوانبێژییەوە سەرسامیان دەکات[3].

بۆ ماوەیەکی باش قورەتلعەین لە بەغدا بەبێ ئازارێکی بەردەوامی دا بە گوێرە سەرنجڕاکێشەکانی. وەلێ وادیارە ئەیارەکانی لە کەربەلا لێی بێدەنگ نەبوون، بە تایبەت میرزا محەمەد حەسەن جەوهەر کە سەرکردەی شێخەکان بوو، هەمو هەوڵێکیان دا تاوەکو حکومەتی لەدژی هان بدەن. میرزا محەمەد پەیوەندییەکی باشی هەبو لەگەڵ والیدا بۆیە توانی بۆچوونی خۆیی بەسەردا بسەپێنێت کە تەمەش والی ناچارکرد نوسراوێك لە بارەی قورەتلعەینەوە بنوسێت‌و بینێرێت بۆ ئەستەنبوڵ پاشان فەرمانی دا بە زیندانیکردنی قورەتلعەین لە ماڵی ئالوسی تا ئەو کاتەی وەڵام لەوێوە دێت.

قورەتلعەین دوو مانگ لە ماڵی ئالوسیدا مایەوە، ئالوسی بێزاری نەدەکرد بەڵکو لە گەڵی کۆدەبویەوەو لە بارەی بانگهێشتە نوێکەیەوە مشتومڕی لەگەڵدا دەکرد، زۆر جار ڕێگەی پێئەدا لە گەڵ چاوەڕێکدا

---

[2] ئاغا محەمەد مصطفى البغدادي، نامەیەکی داخوازی، لە پەراوێزی نامەی نوردەهەم – قاهیرە، 1338کۆچی، لاپەڕە 109.

[3] عبد الحميد ئاوارە، سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 112.

بچێتە دەرەوە، ئەویش دەچو بۆ ماڵی شێخ محەمەد شبل کە لەوێش شوێنکەوتوان و هەوادارانی چاوەڕێیان دەکرد.

ئالوسی لە هەندێ نوسراویدا ئاماژەی بە قورەتلعەین داوە، لە شوێنێنك لەو شوێنانەی کە باسی دەکات دەڵێت: "... ئەو یەکێ بو لەو کەسانەی کە کە لەدوای مەرگی ڕەشتی بە شوێن ڕێگای بابدا ڕۆشتن، پاشان لە هەندێ شتی وەك سپاردن سەرپێچی کرد چونکە وییان ئەو هەڵوەرەو جاڕی ئەوەی داوە سپاردن کۆتایی پێدێت. من سەرباری ئەوەی کە ئەو ئافرەتە دوو مانگ لە ماڵەکەمدا بو هەستم بەشتێکی لەو جۆرە نەکرد، چەندان جار دەکەوتینە مشتومڕەوە. ئەوەی کە لام دروست بو ئەوەیە کە بابی و قورەیی –مەبەستی لە شوێنکەوتوانی قورەتلعەینە– بەك تایەفەن و بیروباوەڕیان لە بارەی ئیمامەکانەوە هەمان بیروباوەڕی کەشفیەکانە –مەبەستی لە شێخەکانە– هەیانە بڕوای وایە سەردەمی سپاردن و پێنج نوێژەکە کۆتایی دێت، هەروەها بڕوایان وایە کە وەحی شتێکی نەبڕاوەیەو بەردەوامە بەڵام مەبەست لە وەحیی دانانی شەرع نییە بەڵکو مەبەست لە وەحیی فێرکردنی ئەو شەرعەیە کە بەر لە خۆیان هاتوە، کە ئەمەش بۆچونی هەندێ لە سۆفیەکانیشە... گەورەترین هۆکاری گومڕابونیشیان ئەوەیە کە بەبێ هیچ تێگەیشتنێك دەڕواننە قسەکانی ڕەشتی و شێخ الاحسانی، لە مەبەستی قسەکانیان تێناگەن و بە ئاقارێکدا

دەیبەن کە بە چەندان قۆناغ دوورە لە ئاینی محەممەدەوە، بۆیە گومڕاترینیان هاوڕێیانی ئەم دوو پیاوەیە..."[1].

[1] محمود شکري الالوسي "مختصر التحفة الاثني عشرية"، قاهیرە، 1373کۆچی، لاپەڕە 24.

## دوکەرتبونێکی تر

لەو ماوەدا کە قورەتلعەین لە مالی ئالوسی زیندان بو دوکەرتبون‌و بۆلەبۆلێکی تر لە نێوان شوێنکەوتوانی لە بەغدار کاظمیە دروست بو، هۆکاری ئەم دوکەرتبونە ئەوە بو کە قورەتلعەین بانگەوازی نوێکردنەوەی شەریعەتی ئیسلامی دەکردو داوای دەکرد هەندێ لە فێرکاری‌و ڕێساکانی بگۆڕێت، بۆیە گروهێك لە شوێنکەوتوانی رازی بون لە کاتێکدا گروهێکی تریان ڕەتیانکردەوە. ئەم دوکەرتبونەش نوسەرێك لە شوێنکەوتوانی ئاماژەی پێداوە کە ئەویش ئاغا محەمەد مصطفى البغدادی یە[2]، کە کوڕی شێخ محەمەد شبلە، لە نامەیەکی بچوکدا ئاماژەی پێداوە تیایدا دەڵێت:

"... نهێنی سەرهەڵدانی ئاشکراکردو پوچەڵبونەوەی نەریتی ڕاگەیاندو نوێکردنەوەی شەریعەتی خوای جاڕدا، لە کۆڕی خۆشەویستاندا روخساری هەڵدەمالی بەلام لە کۆڕی بێگانەکاندا لە پشتی پەچەوە قسەی

---

[2] ئاغا محمد مصطفى البغدادی، سەرچاوەی پێشو، لاپەرە 109 – 110.

بۆ دەکردن، هەندێ لە خۆشەویستان ترسان کاتێك پوچەڵبونەوەیان گوێ لێبو، هەندێکیان ڕاستبونەوەو پێیانوابو کە خوا بە ویستی خۆی هەرچییەکی بوێ دەیکات، هەندێکی تریش لە خەلکانی کاظمیە ترسان کە پێکهاتبون لە سەید محەمەد جەعفەرو سەید حەسەن جەعفەرو سەید عەلی بشرو سەید ئەهاو کازم صوفی، وتیان ئێمە باوەڕمان بە حەزرەتی باڵا هەیە -مەبەستی لە بابە- کە ئەو بۆخۆی زکری خوایەو ئەو هەرگیز شەرعی کۆنی پوچەڵ نەکردوەتەوەو هیچ شتێکی نوێ نەکردوەتەوە بەڵکو تەنها ڕێساکانی زیادکردوەو نوێژو ڕۆژو و حەرامی دوکەڵی دوپاتکردوەتەوە، خاتو قورەتلعەین سنورەکەی بەزاندوەو بێ ئەوەی پرس بە حەزرەتی باڵا بکات ئەو شەرعەی پوچەڵ کردوەتەوە کە لە باوك و باپیرمانەوە بۆمان ماوەتەوە. داناترینیان کە سەید عەلی بشر بو دەستنوسێکی پێشکەش (ماه کو) کرد کە گەشتە حزوری العلي الأعلى -مەبەستی بابە- هەڵبەت بە دەستی پیاوێکدا نێردرابو کە ناوی نەورۆز عەلی بو وە خزمەتکاری سەید کازم رەشتی بو. تابلۆیەکی ڕەوانبێژانە لە وەڵامی ئەو دەستنوسەدا بە دەستی نەورۆز عەلی گەڕایە بۆ پایتەختی کاظمیە و گەیاندیە دەستی سەید عەلی بشرو هاوەڵەکانی، لە بەغداشەوە باوکم -مەبەستی لە باوکی نوسەری ئەو کتێبەیە کە شێخ محەمەد شبلە- لەگەڵ خۆشەویستاندا لە کۆڕێکدا کۆبونەوە کە زیاتر لە حەفتا کەسی لەخۆگرتبو، پاشان تابلۆ پیرۆزەکەیان بە ئاشکرا خوێندەوە کە چەندان ئامۆژگاری پیرۆزو ئایاتی ڕونی تێدابو تا ئەوکاتەی گەشتە سەر فەرمودە پیرۆزەکانی لە بارەی ئەو

خەڵکە تۆقیبوەوە: (لە بارەی ئەو ئافرەتە پاکیزەوە کە وشەی هەق کاری تێکردوە ئەوا دەڵێین ئەو ئافرەتە ئافرەتێکی ڕاستگۆو داناو فرەکردارو پاکیزەیە، هەرگیز بەرپەرچی بڕیارەکانی ئەو پاکیزەیە مەدەنەوە چونکە ئەو لە هەموان شارەزاترەو بۆت نییە هیچ بکەیت تەنها ئەوە نەبێت شوێنی بکەویت چونکە تۆ ناتوانیت لە ڕاستی دۆخ و پێگەی ئەو تێبگەیت)، هەتا دوایی تابلۆکە. کاتێکیش کە دانیشتوان گوێیان لە لێبو زۆر دڵخۆش بونەو سوپاسی خوایان کرد کەوا هیدایەتی داون، ترساوەکانیش بە خۆیاندا چونەوەو خۆیان لەو شتانە دامالی کە باوەڕیان پێی هێنابو..."[1].

ئەو "تابلۆ"یە کە لە بابەوە گەیشە کاظمیە وەك وەحییێك وابو بۆ قورەتلعەین و لە پلەو پایەی بەرزکردەوە، هەر لە نێویدا نازناوێکی نوێی بۆهاتبو کە ئەویش نازناوی "پاکیزە" بو، بۆیە لەو دەمەوە قورەتلعەین لە نێو بابییەکاندا بەو نازناوە ئاماژەی پێدەدرا وە دواتریش کاریگەری خۆیی هەبو وەك لە داهاتودا باسی دەکەین.

[1] عبود الصالحي، سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 45 – 47

## دەربازکردنی لە عێراق

کاتێك هەواڵەکە گەشتە قەزوین کە گوایە قوڕەتلعەین لە بەغدا زیندان کراوە، مامەی‌و باوکی مێردەکەی مەلا محەمەد تەقی بورغانی کەوتنە تەگبیرکردنی ڕێگایەك بۆ دەربازکردنی، هەر بۆیە پەیامیان نارد بۆ یەکێ لە خاوەن دەسەلاَتەکانی کەربەللا کە تێیدا داوایان لێکردوە ناوبژیکاری بکات لە گەڵ حکومەتدا تاوەکو ئازادی بکەن. ئەم پیاوەش لە بۆ ئەو مەبەستە سەفەری کرد بۆ بەغدا، پاشان نامەیەکی بۆ مەلا محەمەد تەقی نوسی کە تێیدا ئەنجامی هەوڵ‌و کۆششەکانی خستوەتەڕو. لە خوارەوە چەند بڕگەیەکی ئەو نامەمان خستوەتەڕو کە بە پێنوسی شێخ عبود صالحی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی نوسەرەکەش قسەکانی ئاراستەی مەلا محەمەد تەقی دەکات:

"کاکی بەڕێز... سەفەرمکرد بۆ بەغداو چوم بۆ ماڵی موفتی ئەمڕۆی بەغدا کە جەنابی بەڕێز مەحمود ئالوسی ئەفەندی یە، لەوێ قوڕەتلعەین‌و سێ ئافرەتی ترو کەنیزەکێکم بینی. جەنابی موفتی بەڕێز داوای لێکردم دۆخی ئەوی بۆ باس بکەم‌و چیرۆکی ئەوی بۆ بگێڕمەوە،

منیش وتم: بەڵێ ئەو ئافرەتێکی باڵاپۆشەو لەو پەڕی خواناسی‌و دینداریدایە، وەلێ هەندێ چیەو چرپەی ئەهریەنی کاری تێکردەو مێشك‌و بیرکردنەوەکانی کۆنترۆڵ کردوە، ئەو ژینگەو نێوەندە نایینیەی کە ئەو تێیدا ژیاوە کاریگەرییەکی زۆری هەبوە لەسەری چونکە ئەو لە ئامێزی خواناسی‌و دینداریدا دەژی‌و لە ماڵی زانست‌و پەرۆزیدا پەروەردە بوە. هەروەها جەنابی موفتی بەڕێز لە بارەی مێژوی ژیان‌و رەوشی باوکییەوە پرسیاری لێکردم، منیش وتم: ئەمڕۆ ئەو پیاوی یەکەمی ئێرانە لە زانست‌و خواناسیدا. قسەکانم کاری کردە دەرونی جەنابی موفتی بەڕێز بۆیە پێی وتم داوا لە پاشای بەڕێز دەکەم سەرفەرازی بکەن‌و داوای لێبوردنی لێبکەن سەبارەت بەو قسانەی کە لەبارەیەوە کراوە دواتر بنێردرێتەوە بۆ لای خێزانەکەی... ئەو ئێستا بەو پەڕی ڕێزلێگرتنەوە لە ماڵی جەنابی موفتی بەڕێزە، منیش ئەمڕۆ کە رۆژی هەینی سیەو دەکاتە رۆژی هەشتی مانگی رەبیعی دووەم دەچم بۆ بەغدا تاکو ئەو پەڕی هەوڵ‌و کۆشش بدەم لە پێناو سەرفەرازکردنی، مەلا حەسەن جەوهەریش پێی خەفەتبارە... لەگەڵ ئەوەشدا سەرتاپای زانایانی بەغدا ڕێزێکی بێ پایانیان هەیە بۆی‌و ئەو پەڕی جێگەی ڕێزو پێزانینە لە لایان، ئەوەی کە لەلای ئێوە وتراوە بێ‌جێیەو ڕاست نییە... بۆ ڕونکردنەوەی ڕاستیەکان ئەم نامەیەم نوسی. ان شاء الله بەهێزو توانای خوا بە هەر جۆرێك بوبێت دەیگوازمەوە بۆ ماڵی

خۆم، دواتریش ان شاء اللە لەگەڵ ئەو بەرێزانەدا دەینێرمەوە بۆ لاتان، ئیدی ئێوەش بێ خەم و ئاسودە بن"[1].

دواجار فەرمان لە ئەستەنبولەوە هات کە قورەتلعەین ئازادکەن و لە عێراق دەربازی بکەن، بۆیە نزیکە سی کەس لە گروپەکەی لە گەڵیدا کەوتنە رێ تاکو لە سەفەرەکەیدا هاورێی بن، لەوانە: شێخ محەمەد شبل، کوڕەکەی کە ئاغا محەمەد مصطفی بو لە تەمەنی دە سالیدابو، لەگەڵ شێخ صالح کریماوی و، شێخ سوڵتان کەربەللاوی و، سەید ئەحمەد یەزدی و، سەید محسن الشعرباف الکاظمی و، مەلا ئیبراهیم مەحللاتی و، حاجی محەمەد کەرادی و، سەعید جەباری و، عبدالهادی زەهاوی و، حەسەن حللاوی و، دەرویش مکوئی و، چەندانی تر.

---

[1] ئاغا محمد مصطفی البغدادي، سەرچاوەی پێشو، لاپەرە 111 – 114

## قورەتلعەین لە کرمانشاه

قورەتلعەین بە هاوشێوەی کۆڕەوێکی گەورە لە بەغدا دەرچوو، چونکە خۆی و ئەو ئافرەتانەی کە لەگەڵیدا بون سواری حوشتر بوبون لەکاتێکدا ئەو پیاوانەی کە لە گەڵیدا هاتبون سواری ئەسپ بوبون. دوای سەفەرێکی درێژخایەن گەشتنە کرمانشاه، ئاغا محەمەد مصطفى لە نامە پچوکەکەیدا وەسفێکی زۆری ئەو قاوقیژەی بۆکردین کە قورەتلعەین لەو شارەیە نایەوە. لە خوارەوە پوختەیەك لەو ڕوداوەی ئەوێ دەگێڕینەوە.

کاتێك کە قورەتلعەین گەشتە کرمانشاه فەرمانی دا بەوەی لە سێ ماڵدا دانیشن، یەکیان بۆ خۆی و ئەو ئافرەتانەی کە لەگەڵی هاتون لەگەڵ هەندێ زاڕادا، دووەمیشیان تایبەتکرد بۆ شوێنکەوتوانی تر، سێیەمیشی تایبەتکرد بۆ کۆبونەوەی خەڵکی تاکو بانگهێشتنەکەیان پێڕابگەیەنێ. لە ڕۆژی دواتردا فەرمانی دا بە کردنەوەی دەرگای ماڵی سێیەم کە لەوێش گەورە پیاوان و میرو خان و بازرگانەکانی ئەو شارە کۆبوەوە بەرادەیەك کە هێندە زۆربون شوێنی دانیشتنەکەیان بەرتەسك بوبو، شێخ صالح کریماوی

هەستایەوەو ڕاڤەی سورەتی "الکوثر"ـی بە عەرەبی بۆ دەخوێندنەوە، لەلای ڕاستیەوە شێخ محەمەد شبل‌و مەلا ئبراهیم مەحلاتی‌و شێخ سوڵتان کەربەلایی هەستانەوەو قسەکانی ئەویان وەردەگێڕایە سەر فارسی.

تەواوی شارەکە لە بۆ ئەم باسە وروژابو هەر بۆیە ناوچەی دەورو پشتی ماڵەکەی قەرەباڵغ بوبو بەڕادەیەك کە کوچەو کۆڵانەکان بەرتەسك بوبون، ژنان بە ڕۆژدا دەهاتن بۆلای ئەویش ئایاتە نهێنی‌و نوێکانی بۆ دەخوێندنەوە، ئێوارانیش هەندێ لە میرو زانایان دەهاتن بۆ دیدنی لەپشتی پەردەوە وە گوێیان بۆ قسەکانی دەگرت پاشان بە تیامانەوە دەڕۆشتن، هەندێکی تر بە سەرنجڕاکێشراوی دەچوە دەر. هەمو ڕۆژێك لە لایەن خەڵکی ئاسایی‌و زانایانەوە پرسیاری بۆ دەهات ئەویش بە خێرایی وەڵامی بۆ دەنوسین.

پیاوە ئاینیە توندڕەوەکان ئەم دۆخەیان بەدڵ نەبو و پێی بێزاربون؛ بۆیە لەو بارەوە قسەیان لەگەڵ سەرگەورەکەیاندا کرد کە ئاغا عبداللە بەهبەهانی بو وە داوایان لێکرد وەڵامی قورەتلعەین بداتەوە لەبارەی ئەو پرسانەی کە ئەو دەیوروژێنێ؛ بۆیە بەهبەهانی چو بۆلای میری بەرپرسی شارەکەو داوای لێکرد قورەتلعەین‌و هاوڕێکانی لە شارەکە دەرکات، میر ناردی بە شوێن قورەتلعەیندا ئەویش بە هاوڕێیەتی شێخ سوڵتان کەربەلایی‌و مەلا ئبراهیم مەحلاتی‌و هەندێ لە ژنانی هاوەڵی چو بۆ کۆشکەکەی، میر کەوتە گفتوگۆ لەگەڵی‌و سکاڵای زانایانی بۆ باسکردو پێیوت کە ئەوان دەیانەوێت بزانن ئامانجی لە پشت ئەم کارانەوە چییە،

قورەتلعەینیش وەلامی دایەوە: ئامانجمان ئەوەیە مژدانە بە هاتنی کەسی چاوەڕوانکراو بدەین بەلگەش لەسەر ئەوە ئەو ئایاتانەیە کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. ئاغا عبداللە بەهبەهانی لەو کۆڕەدا ئامادەبو بۆیە وەك لەروداوەستانێك داوای لێکرد بەدەر لەو ئایاتانە بەلگەیەکی تر بێنێتەوە، ئەویش لە وەلامدا داوای لێکردن "نەفرەت" بکەن، لە شوێنێکدا کە خودی میر دەستنیشانی دەکات هەمویان کۆببنەوەو پاشان نەفرەتی خوا بۆ درۆزنان بنێرن، بەمەش لە ئەنجامدا کەسی ساختە لەجێی خۆیدا دەمرێت.

میر بە شادییەوە پێشوازی لەم داوایەکرد، فەرمانی بە بەهبەهانیش دا کاتێك بۆ نەفرەتکردن دیاری بکات بەلام ئەو پۆزشی هێنایەوەو وتی نەخۆشم هەرکات ساغ بومەوە بەشداری لە نەفرەتکردنەکەدا دەکەم. پاشان لە شار دەرچو و لە دارستانێکی دەرەوەی شار خۆی ونکرد.

بەهبەهانی نامەیەکی نوسی بۆ مامەی قورەتلعەین لە قەزوین تیایدا هەواڵی ئەوەی پێ ڕادەگەیەنێت کە چۆن برازاکەی لە کرمانشاه سەرهەلدانی باب ئاشکرا دەکاتو شەریعەت پوچەڵ دەکاتەوە. دوای تێپەڕبونی پانزە رۆژ چوار پیاو لە خزمانی قورەتلعەین دەگەنە کرمانشاه و لەگەڵ سەرکردەی سەربازی ئەو ناوچەیە ڕێدەکەون کە ناوی سەرتیپ صەفەر عەلی سیە تاوەکو بەزۆر سەفەر بە قورەتلعەین بکەن. لە رۆژی دواییدا بەر لەوەی خۆر هەلبێت سەربازەکان چواردەوری هەر سێ ماڵەکەیان دا کە قورەتلعەینو هاوڕێکانی تێیدا نیشتەجێبون، شتو مەکەکانیان هێنایە دەرو سوار ئەو هێتـرانەیان کرد کە پێشتر ئامادەیانکردبون، قورەتلعەین

بە پەچەوە هات بۆیانو هاواری بەگوێیاندا ئەداو دەیوت: "کەسی چاوەڕوانکراو سەری هەڵدا ئەی بێئاگایان، خوای دڵسۆز سەری هەڵداو ئێوەش مردون!"، پشێوی و ئاشوب دروستبو، پاشان دەستدرێژی کرایە سەر شێخ صالح کریاری و شێخ سوڵتان کەربەلایی و مەلا ئبراهیم مەحلاتی[1].

[1] عبدالحمید ئاوارە، سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 197 – 201

## قورەتلعەین لە هەمەدان

قورەتلعەین خۆی‌و هاوڕێکانی بەرەو هەمەدان بەڕێکەوتن. ئەوەی کە لە بارەی ئەم شارەوە ئاشکرایە ئەوەیە کە زۆرینەی دانیشتوانی شێخەکانن، بۆیە کاتێك کە بیستیان قورەتلعەین بەرەو ئەوێ دێت خۆیان ئامادەکرد تاکو وەك شێخێك لەوان پێشوازی لێبکەن. قورەتلعەین ماوەی نۆ ڕۆژ لە هەمەدان مایەوە کە لەو ماوەدا بە خوێنگەرمییەوە هەوڵی دا بانگهێشتە نوێکە بڵاو بکاتەوە، لەوێش چەندان ژن‌و پیاو پێی کاریگەر بون.

لەوانەی کە لە هەمەدان پێی کاریگەربون دوو مەلای جولەکەبون کە ناویان مەلا ئلیاهو و مەلا لالازار بو، چونکە قورەتلعەین چەند ئایەتێکی تەورات‌و کتێبی پەیامبەرانی نیشان ئەو دوو جولەکە دابو کە لە نێویدا ئاماژەگەلێکی تیایە نیشانە بە هاتنی باب ئەدات بۆیە ئەوانیش سەرسام بون لەو زانیاریە بەرفراوانانەی کە قورەتلعەین لە بارەی کتێبە پیرۆزەکانەوە هەیەتی، کاتێکیش کە لەم بارەوە پرسیاری هەمەجۆریان لێکردوە ئەو بەو

وەڵامی قایلکەر وەڵامی داونەتەوە. ئەمەش یەکەمین تۆو بو بڵاوبونەوەی باتگەیشتی بابی لە نێو جولەکەدا[1].

قورەتلعەین دەیویست سەرگەورەی ڕەنجدەرانی[2] هەمەدان بەلای خۆیدا ڕاکێشێت بۆیە نامەیەکی بەدەست مەلا ئیبراهیم مەحلاتیدا نارد کە تێیدا داوای لێدەکات باوەڕ بە سەرهەڵدانی کەسی چاوەڕوانکراو بێنێت ڕاستی و دروستی قسەکانیشی بە ئایات و فەرمودەی "دروست" بەڵگەدار دەکات. کاتێکیش مەلا ئیبراهیم چوە کۆڕی ڕەنجدەرەوەو نامەکەی بەدەست گەیاند زۆر توڕەبو و بەناشرین ترین زاراوە نەفرەتی لێکرد، مەلا ئیبراهیم بە ئامۆژگارییەوە وەڵامی دایەوەو وتی: "ڕەوا نییە کەوا دۆستانی زانست و چاکەکاری بە بەکارهێنانی زبانی تانەو قسەی ناشرین گەواهـ و بەڵگە ببینن"، ڕەنجدەرەکە هێندەیتر گڕی گرت و لێی بێزار بو بۆیە فەرمانی دا لێدەن و سوکایەتی پێبکەن، فێرخوازەکان هێرشیانکردە سەری و بەچڕی لێیاندا پاشان فڕێیاندایە دەرەوەی خانوەکە. هەندێ کەس هەڵیانگرت و بردیان بۆ ماڵی قورەتلعەین، کاتێکیش کە قورەتلعەین مەلا ئیبراهیمی بەو شێوە بینی خۆشی دەربڕی و پێی وت: "شادییەکی نەبڕاوە بۆ تۆ، سەڵاواتی خوات لەسەر بێت لەبۆ ئەو قوربانییانەی کە لە پێناو بەرزکردنەوەی وشەی

[1] سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 201 – 202.

[2] ڕەنجدەران (مجتهدين): واتە ڕەنجدەر لە دینداریدا، ڕەنجدەر (مجتهد) ناونازێکی تری ئایینی بەیە کە لە خوانامەکان دەدرێت. وەرگێڕ

خوای گەورەدا ئەنجامت داوە"، پاشان فەرمانی بە هاوڕێیان دا تیماری بکەن، بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەجێدا کەوت هەتا چاک بووەوە[3].

---

[3] محەمەد زەندی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە 218 – 219.

## قورەتلعەین مێردەکەی جێدێڵێت

قورەتلعەین هەمەدانی بەجێهێشتو بەرەو شارەکەیو زێدو نیشتیمانی خانەوادەکەی ڕۆشت کە قەزوینە، کاتێکیش گەشتە ئەوێ لە ماڵی باوکی مایەوەو نەڕۆشت بۆ ماڵی مەلا محەمەدی مێردی، بۆیە مێردەکەی چەند ئافرەتێکی نارد بۆلای تاوەکو ڕازی بکەن بێتەوە بۆماڵی خۆی بەلام ئەو زۆر بە توندی نارازیبونی خۆی لە گەڕانەوە دەربڕیو بە ئافرەتەکانی وت: "بڵێن بەو دەبەنگە لەخۆباییە ئەگەر بەڕاستی مەبەستت بوە هاوەڵو هاوسەرم بیت دەبوایە پەلەت بکردایە لە بینینم لە کەربەللا، دەبوایە بەپێی خۆت بهاتیتایە بۆ پاراستنی خۆمو کاروانەکەم بەدرێژی ڕێگا هەتاکو قەزوین، ئەوکات منیش لە ڕێگادا دەمتوانی لە خەوی بێئاگایی بەخەبەری بێنمو ڕێگای هەقی نیشاندەم. بەلام ئەو شتە لەچارەی نەنوسرابو، سێ ساڵیش بەسەر جودابیماندا تێپەڕیوە ئیدی بۆی

نییە نە لەم دونیاو نە لەو دونیا لەگەڵم کۆببێتەوە چونکە بە تەواوی‌و هەتاهەتایە لە ژیانی خۆم دەرمکردوە"[1].

ئەم کارەی کە قورەتلعەین ئەنجامی دا واتە بەجێهێشتنی مێردەکەی سەرپێچی بو لەدژی داب‌و نەریتی شەرعی‌و باوی ئەو سەردەمە کە ئەمەش وەك چەکێك وابو بەدەستی دوژمنانیەوە هەر بۆیە رەخنەیەکی یەجگار توندیان لێگرت‌و چەندان تاوانیان خستەپاڵی. یەکێ لە نوسەرە بەهائیەکان هەوڵی دا بەهانە بۆ ئەو کارە بێنێتەوە بۆیە لەو بارەوە وتی: "شتێکی شاراوە نییە کە خانمێکی وەك قورەتلعەین لە زانست‌و خواناسیدا بەسەر پیاواندا سەرکەوتبو، رۆحی ئەو تامی شیرینی هەنگوینی چاکەکاری‌و باوەڕداریەتی کردبو، هەمو ئەو کەسانەی سەرسام کردبو کە گوێیان لە ئاخاوتنە لێوانلێوەکانی زبانی بەرێنیان دەبو، هەرگیز قایل نییە بەوەی وەك سەرجەم ژنانی تر بە رسوایی لە ماڵی هاوسەرەکەیدا بێت کە بەردەوام رەخنەی لە گشت کردەو قسەو هەڵس‌وکەوتەکانی دەگرت، قایل نییە بەوەی پەنابگرێتە گۆشەی ماڵەکەی‌و تەنها خۆی بە کاروباری ماڵداریەوە خەریك بکات، رازی نابێت بەوەی خۆی بکاتە دیلی دەستی کەسێك کە هەڵگری ئەو جۆرە رەفتارو رەوشتانە بێت کە ئامۆزاکەی هەڵگریەتی. بۆیە هیچ گوناهێك لەوەدا نییە کەوا بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان رازی نەبوە بە داواکاری مێردەکەی‌و بە تەواوی رەتی کردوەتەوە،

---

[1] عبدالحميد ئاوارە، سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 203 – 204

ئەوکات جیابونەوە کەوتە نێوانیانەوە، چاویشی لە منداڵەکانی پۆشی و بەجێیهێشت"[2].

[2] محەمەد زرندی: سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە 220.

## کوشتنی مەلا محەمەد تەقی

ئەو بڕیارەی کە قورەتلعەین دەریکرد لەبارەی بەجێهێشتنی مێردەکەیەوە هۆکاربو بۆ دروستبونی ناکۆکییەکی توند لە نێوان خۆیو مەلا محەمەد تەقی باوکی مێردەکەی کە سەرگەورەی زاناکانی قەزوین بو وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، باوکی قورەتلعەین هەوڵی دا تەبایی لە نێوان کچەکەیو براکەیدا دروست بکات بەڵام سەرکەوتو نەبو بۆیە ناچاربو دەست بکێشێتەوەو لێبگەڕێت شتەکان بە ئاراستەی خۆیاندا بڕۆن.

مەلا محەمەد تەقی وەهای پێهات لەدوای هەمو نوێژێك دەچوە سەر دوانگەو بە نەفرەتو بە تانە دادەبەزییە سەر شێخ ئەحمەد الاحسانیو سەید کازم رەشتیو سەرجەم شوێنکەوتوانیان بە بابیو ئەوانی تریشەوە. بەو هۆیەوە هەڵچونو ئاژاوە لەنێو خەڵکیدا بڵاو بوەوە هەر بۆیە دەکەوتنە شوێن بابیو شێخەکانو دەستڕێژییان دەکردە سەریان. یەکێ لەو چیرۆکانەی کە لەو بارەوە دەگێڕدرێتەوە: یەکێ لە شێخەکان لەو ماوەیەدا بوێری ئەوەی دەبێت کە پیاهەڵدان بۆ ئەحسانیو رەشتی بکاتو چاکەکانیان بخاتەرو، کاتێکیش کە مەلا محەمەد تەقی ئەمە دەبیستێت بڕیاری

بەکافربونی لەسەر ئەدات‌و فەرمان ئەدات دەریکەن لە شار، بۆیە خەلکیان لیٚ کۆکردەوەو میٚزەرەکەیان لەسەر داکەندو پاشان ملیان بەستەوەو بە پیٚخاوسی بەنیٚو کوچەو کۆلانەکانی شاردا ڕایانکیٚشاو بە جنیٚو لیٚدانەوە نیشتنە سەری[1]. لەبارەی پیاویٚکی ترەوە دەگیٚڕنەوە کە ناوی مەلا جەلیل ئەرومی بوە، ئەم پیاوە بەنیٚو شاراندا گەڕاوەو مژدانەی بە سەرهەلدانی باب داوە، کاتیٚکیش بە قەزویندا تیٚپەڕیوەو مەلا محەمەد تەقی پیٚی زانیوە فەرمانی بە هەندیٚ لە فیٚرخوازەکانی داوە کە بیگرن ئەوانیش گرتویانەو هیٚناویانە بۆ مالەکەی، پاشان فەرمانی داوە بیکەن بە فەلاقەوەو قاچی دارکاری بکەن[2].

ماوەیەکی کەم بەسەر ئەوەدا تیٚپەڕی بو کاتیٚك کە پیاویٚکی نەناسراو هیٚرشی کردە سەر مەلا محەمەد تەقی لەکاتیٚکدا کە لە بەرەبەیاندا لە مزگەوت نویٚژی دەکرد بە خنجەر چەند لیٚدانیٚکی کوشندەی تیٚهاویٚشت[3]. بە کوشتنی ئەو تەواوی شار وروژا، مەلا محەمەدی کوڕی چو بۆ خانەی حکومەت‌و بە پرمەی گریانەوە جلەکانی لەبەر خۆیدا دادڕی ئەمەش تیٚهەلچونی لە نیٚوان خەلکیدا دروستکردو ئاگری فیتنەیی نایەوە هەر بۆیە ژیانی شیٚخ‌و بابیەکان کەوتە مەترسییەکی زۆرەوە[4].

---

[1] عبدالحسین ئاوارە، سەرچاوەی پیٚشو، ل 205 – 206.

[2] محەمەد زەرەندی، سەرچاوەی پیٚشو، ل 220.

[3] عبدالحسین ئاوارە، سەرچاوەی پیٚشو، ل 208.

[4] ئاغا محمد مصطفى البغدادي، سەرچاوەی پیٚشو، ل 118 – 119.

ئەوەی کە لەم بارەوە جێی سەرنجە ئەوەیە کە قورەتلعەین بەر لە کوژرانی ماصەی بە چەند رۆژێك فەرمانی بە هاورێکانی داوە کە قەزوین بەجێبێڵن‌و بگەرێنەوە بۆ نیشتیمانی خۆیان، پێی وتون: "زەمین لەرزەیەکی گەورە روبەروی قەزوین دەبێتەوەو خوێنی هەموتان دەرێژێ، خوا لە ئاینەدەدا ئێوەی بۆ چاکە دەوێت..."، بەلآم لە نێو هاورێکانیدا دوو پیاوی جیاکردەوە کە ئەوانیش شێخ صالح کریماوی‌و مەلا ئبراهیم مەحلاتی بون، پێی وتن کە ئەوان کاتی ئەوەیان هاتوە شەهیدبن[5].

پێشگۆییەکەی قورەتلعەین هاتەدی، چونکە شێخ صالح کریماوی لە یەکەمین ئەو کەسانەبو کە تاوانبار کرابو بە کوشتنی مەلا محەمەد تەقی، ئەوەبو چوە تاران‌و لەوێش لە گۆرەپانی ناوەندی تاراندا کوژرا، ئەو بە یەکەمین کەسیش دادەنرێت لە ئێران کە خوێنی لە پێناو بانگهێشتی نوێدا رژابێت، پاشان هەرچی‌و پەرچیەکانی قەزوین هێرشیانکردە سەر تاوانبارکراوەکانی تر لەوانە مەلا ئبراهیم مەحلاتی کە جەستەیان پارچە پارچە کرد[1]. قورەتەلعینیش لە دامێنی کۆشکی حاکمداو لە ژێر چاودێرییەکی توندوتۆڵدا زیندانی کرا، ماوەیەك لەوێ مایەوە، بەلآم توانی نامەیەك بۆ میرزا حسێن عەلی نوری لە تاران بنێرێت‌و داوای هاوکاری لێبکات[2]، ئەم پیاوە خاوەن پارەو دەسەلآتێکی زۆر بو وە یەکێك بو لەو کەسانەی کە هەر لەسەرتاوە بانگهێشتی بابییان لەئامێزگرت کە خودی

---

[5] محەمەد زرندی، سەرچاوەی پێشو، ل 222 – 224.

[1] عمر رضا کحالة: "أعلام النساء"، دمشق 1959، بەرگی4، ل 197 – 198.

[2] عبدالحسین ئاوارە، سەرچاوەی پێشو، ل 217 – 221.

باب نازناوی "بهاء الله"ـی لێنابو، ئەویش کەسانێکی نارد بۆ قورەتەلعین کە توانییان بیرفێنن و لە قەزوینەوە بیبەن بەرەو تاران، لەوێش لە ماڵی خۆی حەشاری دا. قورەتلعەین بە شاردراوەیی لە ماڵی بهاء مایە هەتا ئەو کاتەی بریارەرا کۆنگرەی "بهدەشت" لە نزیك خوراسان ببەسرێت بۆیە رۆشت تاوەکو بەشداری تێدا بکات.

## کۆنگرەی بهدەشت

"بهدەشت" شوێنێکی فرە مێرگو دارستانا‌وی‌یە دەکەوێتە سەر ڕوباری شەهرود لەنێوان مازندەرانو خوراساندا. بابیەکان بڕیاریاندا لەوێ کۆنگرەی خۆیان بەسن لە ئەنجامی ئەوەی کە باب لە لایەن حکومەتەوە لە قەلای "ماه کو" دەستگیرکرا، ئەوان بۆیە ئەوێیان هەڵبژارد چونکە شوێنێکی دور بو لە قەرباڵخی خەڵکو مشەخۆرەکانەوە. ئامانج لە بەستنی کۆنگرە دوو شت بو، یەکەمیان بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك لەبۆ ڕزگارکردنی باب لەزیندانی، دووەمیان بۆ تاوتوێکردنی پرسی شەریعەتی ئیسلام کە ئایا پوچەڵ بکرێتەوە یان وەك خۆی بهێڵرێتەوە. کۆنگرە لە حوزەیرانی ساڵی 1848ـی زاینیدا بەسترا کە گشت جێسەرە بابیەکانی تەواوی شارە ئێرانیەکان تێیدا بەشداربونو ژمارەیان گەشتە هەشتاو یەك کەس کە لەنێویاندا قورەتلعەینو بهائوڵلا بو، هەمویان هاتبون تەنها "باب الباب" نەبێ واتە مەلا حسێن بەشروئی، چونکە لە خوراسان بە شتێکی ترەوە سەرقاڵ بو.

لەراستیدا، کۆنگرەی "بەدەشت" زۆر گرنگە چونکە دوو سەردەمی مێژوی بانگهێشتی بابی لێك جیادەکاتەوە. چونکە بەر لە کۆنگرەی "بەدەشت" ئەم بانگهێشتخوازانە وەك گروهێکی شێخی لەقەڵەم ئەدران کە تەنها لە چەند وردەکارییەکی پچوکی بێ بایەخدا جیاوازییان هەبێت، بەڵام لەدوای کۆنگرە بانگهێشتی بابی بوە گروهێکی سەربەخۆ کە لەسەرپێی خۆی وەستا یان بە دەربڕینێکی تر بڵێین بوە ئاینێکی نوێ.

وادیارە بەشداربوانی ئەم کۆنگرەیە هێندە بایەخیان بەوە نەئەدا کە باب ڕزگار بکەن هێندەی ئەوەی کە بایەخیان بە شتێکی تر ئەدا کە ئەویش ئەوەبو: ئایا شەریعەتی ئیسلامی پوچەڵ بکرێتەوە یان وەك خۆی بمێنێتەوە؟ نوسینەکان ئاماژە بەوە ئەدەن کە ئەوان هەر لە سەرەتاوە بون بە دوو دەستەی جیاوازەوە: یەکیان پێیوایە پێویستە شەریعەت دەستکاری بکرێت، ئەوی تریشیان پێیوایە کە پێویستە لەسەر شەریعەتی کۆن بمێننەوە.

قورەتلعەین پێشەوایی ئەو کەسانەی دەکرد کە دەیانوت پێویستە شەریعەت دەستکاری بکرێت، ڕای وابو کە باب پێگەی لە هەمو پێغەمبەرانی پێشوی خۆی تر مەزنترەو مافی ئەوەی هەیە ڕێسا کۆنەکانی ئیسلام پوچەڵ بکاتەوەو ڕێسای نوێ بێنێتە کایەوە. ئەو کەسانەشی کە لەدژی ئەم بۆچونە بون محەمەد عەلی بارفرۆشی پێشەوایی دەکردن کە ئەو گەنجە بو شاوڕێیەتی بابی کرد لە گەشتەکەیدا بۆ حەج و خودی باب نازناوی "القدوس"ـی لێنا، خاوەن پێگەیەکی باڵابو لەلای بابیەکان وە هەندێکیان

لە ئاست مەلا حسێن بەشرویی دا دەیان بینی‌و بگرە زیاتریش، ئەم "قدوس"ـە بە توندی لەدژی قورەتلعەین وەستایەوەو زۆرێك لە بابیەکان شوێنی کەوتن، ئەو بۆچونی وابو کە باب هیچ نییە جگە لە کەسێکی رەواجکار بۆ شەریعەتی ئیسلام‌و کەسێکە چاکسازی لەو گەندەڵی‌و بەدەمەوە هەڵبەستنانەدا دەکات کە هاتوەتە نێو شەریعەتی ئیسلامەوە، بۆیە دەبێ لە تەواوی وردەکاریەکانیدا وەك خۆی بمێنێتەوە[1].

لە کاتێکدا کە لە کۆنگرە جیاوازی لە نێوان قورەتلعەین‌و قدوس دا توندتر دەبو بەهائوڵڵا بێدەنگی راگرتبو وادیاربو کە دەیویست بێلایەنی خۆی لە نێوان ئەو دوو دەستەدا راگرێت‌و لە چاوەروانیدا مایەوە تا ئەو کاتەی رۆژگار تاوتوێی دەکات. قورەتلعەین بەردەوام بو لە کۆششی خۆی لە پێناو سەرخستنی بۆچونەکەی‌و هەمو هەوڵێکی ئەدا تاوەکو بەلای خۆیدا بیانکێشێت، ئەو بە باشی دەیزانی کە ئەگەر بۆچونەکەی سەرکەوێت ئەوا زۆرێك لە شوێنکەوتوانی لە بانگهێشتی بابی دور دەکەونەوە، بەڵام وێرای ئەوەش سوربو لەسەر بۆچونی خۆی‌و رایگەیاند: "بێگومان ئەم کارە دێتە گۆرەپانی بونەوەو ئەم وتەیەش دەکەوێتە بەر گوێی هەموانەوە، کەواتە هەتا خێراتر ئەم شتە پەنهانانە ئاشکراکەین ئەوا چاکترو جوانترو سەرکەوتوترو بەکەڵکتر دەبو بۆ ئەم کارەی کە ئێمە دەیکەین تاکو هەمو لاوازێك کە بەرگەی نوێبونەوە ناگرێت لێمان جیابێتەوەو تەنها ئەو کەسە

[1] سەرچاوەی پێشو، ل 220 – 221.

بەهێز دڵسۆزانەمان لەگەڵ ببینێت کە خۆی دەکاتە قوربانی بۆ ئەم ڕێبازە ڕاستەو سەرسوڕمێنە"[2].

دواجار قورەتلعەین بڕیاریدا کارێك بکات ئەو بۆڵەبۆڵە یەکلایی بکاتەوە کە لەنێو ئەو حۆزەدا دروستبوە، ڕۆژێك کە قدوس‌و زۆربەی حۆزەکە لە خێوەتەکەی بەهائوڵڵادا کۆبوبونەوە قورەتلعەین کە ڕوخساری هەڵماڵی بو وە خۆیی ڕازاندبوەوە خۆیی کرد بە خێوەتەکەداو سەرسامی کردن، ئەمە بە پێچەوانەی نەریتەکانیەوە بو چونکە ئەو پێشتر پابەندبو بە پەچەوە لەسەر شێوازی ئەو ئافرەتانەی سەردەمی خۆی پەچەی توندوتۆڵ دەبەست، وەکو وابێت بیەوێت بەو کارە یەکێ لە ڕێساکانی شەریعەت پوچەڵ بکاتەوە کە ئەویش حەرامکردنی خۆڕازاندنەوەیە کە قورئان سەپاندویەتی.

هاتنەناوەوەی قورەتلعەین بەم شێوەیە سەرسامییەکی گەورەی لەنێو ئەو حۆزەدا نایەوە. خاوەنی کتێبی "مطالع الأنوار" لە باسکردنی ئەو ڕوداوەدا دەڵێت: "خەڵکی سەرسام بون‌و بەرامبەر بەم دیمەنە چاوەڕوانەکراوە بە تیامانەوە هەستانە سەرپێ. پێیانوابو کە بینینی بە بێ پەچە شتێکی ئەستەمە تەنانەت تەماشاکردنی سێبەرەکەشی شتێکی شیاو نییە چونکە وایاندادەنا کە فاطمة الزهراء یەو بە تێڕوانینی ئەوان سومبولی پاکیزەیی‌و داوێن پاکییە"[3].

[2] ئەحمەد زرندی، سەرچاوەی پێشو، ل 234.
[3] سەرچاوەی پێشو، ل 232 – 235.

هەندێکیان هەوڵیاندا روخساریان بە دەستیان بپۆشن، هەندێکی تریان سەریان بە عاباکانیان پۆشی تاکو چاویان نەکەوێتە سەر روخساری قورەتلعەین، کەسیان خۆیان پێ ڕانەگیرا بۆیە بە چەقۆکەی دەستی دای لە ملی پاشان بە هاوارەوە لە کۆڕەکە دەرچو لە کاتێکدا کە خوێنی لێدەڕژا، هەندێکی تریش کەوتنە شوێنیو چیتر نەگەڕانەوەو لە بانگهێشتەکە دابڕانو گەڕانەوە سەر بیروباوەڕی پێشویان[4]. ئەوانەشی کە خۆیان ڕاگرتبو بەبێ جوڵەو بە تیامانەوە ڕاوەستابون نەیاندەزانی چی بکەن. قدوسیش لەو پەڕی تورەبونیدابو شمشێرەکەی بەدەستەوەبو وەکو وابێت بیەوێت پەلاماری قورەتلعەین بداتو بیکوژێت.

قورەتلعەین هیچ کاریگەر نەبو بەم ڕوداوە، شمشێرەکەی قدوسیش هیچ نەیترساند بەڵکو بەو پەڕی بوێرییو ڕەوانبێژییەوە هەستایە سەرپێو وتاری بۆ ئامادەبوان دا. خاوەنی کتێبی "مطالع الأنوار" دەڵێت: بە روخسارێکی گەشەوە کە تێیدا هەستی خۆشیو شادیو سەرکەوتنی پێوەدیاربوە هەستاوەتە سەرپێو بە ستایلێك کە لە ستایلی قورئان دەچێت کەوتوەتە وتاردان، پاشان وتویەتی: "من ئەو وشەم کە هەمو وەستاوێك ئەیدرکێنێتو هەمو چاڵی زەمینێك ئێی ڕادەکات"، پاشان ئاوڕی دایەوە بەرەو قدوسداو لۆمەیکرد کەوا گوێڕایەڵی نەبوە، دواتر قسەکانی ئاراستەی هەموان کردو داوای لێکردن لەبەر ئەم بۆنە خۆشە ئاهەنگ بگێڕن، وتی:

---

[4] لێرەدا یەکەر بۆ دەبێتە ئەو کەسە قورەتلعەین نییە، قدوسیش نییە چونکە باس لەوە دەکات کە قدوس لەو دۆخە قورەیەی شمشێرەکەی هەڵکێشاوە هێشتا لە بن کێژەکەدایە، ڕەنگە یەکێ لە دابیستوان بێت کە ناڕازییە بە جەنابی کەوتنی قورەتلعەین. وەرگێڕ

"ئەمڕۆ ڕۆژی جەژن و خۆشی هەمووانەو ئەو ڕۆژەیە کە لەمپەرو بەربەستەکانی ڕابردوی تیادەشکێت، ئەوەی کە دەیەوێت بەشداری لەم شکۆیییەدا بکات با هەڵسێتەوەو هاوڕێکەی لەئامێز بگرێت"[1].

ئەم هەڵوێستە بوێرانەی قورەتلعەین کە "مطالع الأنوار" دەیگێڕێتەوە نەیارانی بابییەکان بە شێوەیەکی تر دەیگێڕنەوە، خاوەنی کتێبی "مفتاح باب الابواب" دەڵێت گوایە قورەتلعەین لە کۆنگرەدا چوەتە سەر دوانگەو وتویەتی:

"ئەی بێگانەو خۆشەویستان گوێبگرن... بزانن کە ڕێساکانی شەریعەتی موحەممەدی ئێستا بە سەرهەڵدانی باب پوچەڵ بوەتەوە، ڕێسا بابییە نوێیەکان هێشتا بەدەستمان نەگەشتوە، سەرقاڵبون بە نوێژو ڕۆژو زەکات و ئەو شتانەی کە موحەممەد هێناویەتی هەمویان شتانێکی پوچەڵ و کارگەلێکی بێجێن، چیتر هیچ کەس کاری پێناکات مەگەر بێئاگاو نەفامەکان نەبێت، بەرێزمان "باب" سەرتاپای وڵات دەکاتەوەو سەرجەم بەندەکان گوێڕایەڵ دەکات، هەمو ئەو حەوت هەرێمە کە خەڵکی لێ نیشتەجێیە ملکەچی دەبن، گشت ئاینە هەبوەکانیش یەك دەگرنەوە، تاوەکو تەنها یەك ئاین بمێنێت، ئەو ئاینە ڕەوایەش ئاینە نوێکەی ئەوە، شەرعە نوێکەی ئەوە، کە هێشتا نەگەشتوە بەدەستمان تەنها نەختێکی نەبێ، جابۆیە بە پشت بەستن بەوە پێتان دەڵێم و بزانن کە قسەی من ڕەوایە: ئەمڕۆ نە فەرمان هەیەو نە بێگاری، نە ڕەتکردنەوەو نە توندوتیژی،

---

[1] محەممەد مەهدی خان، مفتاح الابواب، قاهیرە، 1321کۆچی، ل 180 – 181

ئێمەش ئێستا لە سەردەمی وچانداین[2]، جابۆیە لە کەمەوە زیادیکەن، ئەو پەردەی نێوان خۆتانو ژنەکانتان بدڕن، بەوەی کە بەشداریان لەکاردا پێبکەن، وە لە کرداردا هاوبەشیان بکەن، ئاسودەیانکەن، لە گۆشەگیرییان دەرکەنو بیانهێننەدەر، ئەوان گوڵی دونیان، گوڵ هەر دەبێ لێبکرێتەوەو بۆن بکرێت، چونکە بۆ لە ئامێزگرتنو بۆنکردن دروستکراوە، ئاکرێ نە بەچەنو نە بەچۆن بۆنکەرانی بژمێردرێتو سنوردار بکرێت، چونکە گوڵ دەدورێتەوەو لێدەکرێتەوە، وەك دیارییەك دەدرێتە خۆشەویستان، بەڵام کۆکردنەوەی پارەو چەوساندنەوەی بەرامبەرەکەت رەچەڵەکی هەمو گوناهێكو بنەڕەتی هەمو زیانو بەدناکامییەکە، چونکە پولو پارە بۆ ئەوە نەهاتوە هەندێکمان کەڵکی لێوەرگرینو هەندێکی ترمان پێیایدا بڕوانین، بەڵکو مافێکی هاوبەشەو تەنها بۆ کەسانێك زەوت نەکراوە، بۆ ئەوە هاتوە خەڵکی لە نێو یەکتردا ئاڵوگۆڕی پێبکەن، ناکرێ کەسانێکی دیاریکراو قۆرخی بکەن بۆ خۆیان، جابۆیە پارەکانتان هاوبەشکەن، تاکو هەژاریتان لەسەر لاچێو بەدناکامیتان لەسەر نەمێنێ، با دۆڵەمەندەکانتان یارمەتی هەژارەکانتان بدات، خۆشییەکانتان لە خۆشەویستەکانتان مەشارنەوە، چونکە ئێستا هیچ لەمپەرو بەربەستێك نییە لە بەردەمتان، هیچ ڕێگریو بەرگرییەك نییە، بۆیە بەختی خۆتان لەم ژیانە وەرگرن، چونکە لەدوای مەرگ هیچ شتێك نییە"[1].

---

[2] ئەلبەتە ئەم قسانە لە دەقە عەرەبییەکەیدا خاوەن کێشو سەروایەو تایبەتمەندییەکی ئەدەبی پێوە دیارە لە عەرەبی ... بەڵام بەکوردی ئەو چێژە نابەخشێ. وەرگێڕ

[1] ئەحمەد زرشی، سەرچاوەی پێشوو، لا 235 – 236

ئێمە ناتوانین لە ڕاستیو دروستی ئەم وتارە دڵنیا بین، چونکە بە پێنوسی یەکێ لە نەیاران گێڕدراوەتەوە، وەك ئاشکرایە سروشتی نەیاریش وایە مەیل دەکات لە گێڕانەوەی ڕاستیەکاندا زیادەڕەوی بکات یاخود بڵێین درۆی بە دەمەوە هەڵبەستێت. هەرچونێك بێت، کۆی ئەو کەسانەی کە دەیگرنەوە —بە بابیەکانو نەیارەکانیشیانەوە— کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەو وتارە ناکۆکییەکی توندی لەنێو ئامادەبواندا دروستکردوە، چونکە هەندێکیان بە توندی چونەتە پاڵ بۆچونی قورەتلعەین هەندێکی تریشیان بە توندی چونەتە پاڵ بۆچونی قدوس. کتێبی "مطالع الأنوار" ئەم ناکۆکییە توندەی نێوان بابییەکان باس دەکاتو دەڵێت:

"تێکچونێکی گەورە دروستبو لە نێوان ئەو کەسانەی کە بە هەمو هەوڵێکیانەوە هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی ئەم چاکسازییە. هەندێکیان ڕازی نەبون بە گۆڕانێکی سەرەکی لەو جۆرەو پێیانوابو کە ئەمە خودی گومڕابونەو ڕازی نەبون بە دەستکاری کردنی گەورەترین ڕێساکانی ئیسلام کە ناتوانرێت دەستکاری بکرێت، بەرەیەکی تریش پێیانوابو قسەکانی "پاکیزە"[2]" لەم جۆرە دۆخانەدا یەکلاکەرەوەیەو ئەرکە لەسەر هەمو باوەڕداران گوێڕایەڵی بن، هەندێك لەوانەش کە بێزاربون بە هەڵسوکەوتەکانی قورەتلعەین خۆیان بە قدوسەوە گرتو وەهایان دانا کە ئەو تاکە نوێنەرو جێگری بابە کە بۆی هەیە لەو جۆرە دۆخە مەترسیدارانەدا بڕیار بدات، بەرەیەکی تریش جیا لەمانە وەها لەو

---

[2] پاکیزە (طاهرة) نازناوی دووەمی قورەتلعەین. وەرگێڕ

ڕوداوەیان دەڕوانی کە سەرتاپای تاقیکردنەوەیەکی خودایە بۆ جیاکردنەوەی ڕاستگۆیان لە درۆزنان، باوەڕداران لە گومڕابوان. زۆربەی جار پاکیزە ڕازی نەدەبو بەوەی گوێڕایەڵی قدوس بێتو دەیوت: (من وەك فێرخوازێك لە قدوس دەڕوانم کە باب بۆیناردوم تاکو فێری بکەمو پاڵفتەی بکەم، جگە لەمە بە هیچ جۆرێکی تر لێی ناڕوانم). قدوس ڕێی لەخۆی نەگرت بۆ تاوانبارکردنی پاکیزە بەوەی کە ئەو خاوەنی ئەم فیتنەیەیەو بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئەو کەسانەی پاڵپشتی لە بۆچونی دەکەن کەوتونەتە هەڵەوە. بارگرژی نێوان ئەم دوانە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بەردەوام بو تا ئەوکاتەی بەهائوڵلا ناوبژیکردنو بە تەواوی نێوانیانی ڕێکخست، ئەو برینەش تیماربو کە زادەی ئەم تێهەڵچونو ناکۆکییە توندەبو، بەم شێوە هەردوکیان کۆك بونەوە لەسەر ئەوەی ڕێگای خزمەتکردنێکی بەرهەمهێن بکەن بە ئامانج. مەبەست لەم کۆبونەوە هاتەدی، چونکە بانگەوازکردنی ڕژێمی نوێ وەك ئەوە وابو فو بە شەیپوردا بکرێت، بۆیە گشت ئەو نەریتە کۆنانەی کە کۆدەنگی لەسەرەو ویژدانی هەمو خەڵکی بەستودتەوە هەڵوەشایەوە، وە بەو پەڕی دلێری و چاونەترسییەوە سڕانەوە. ڕێگا خۆشکرا بۆ ڕاگەیاندنی ئەو ڕێساو یاسا نوێیانەی کە ئەم دۆخە نوێیە هێناونیەتە کایەوە. ئەو خەڵکە زۆرەش کە لە بەهدەشت کۆببونەوە خۆیان ئامادەکرد بۆ سەفەرکردن بەرەو مازندەران. قدوس پێکەوە لەگەڵ پاکیزەدا لە کاروانێکدا بەڕێکەوتن کە بەهائوڵلا بۆی ئامادەکردبون. لە ڕێگەدا پاکیزە هۆنراوەیەکی ڕێکدەخستو داوای لە هاوڕێیان دەکرد کە لە میانەی

ڕۆشتنیاندا لە دواوەی کاروانەکە بیهۆننەوە، دۆڵو کێوەکان دەنگۆی ئەو سرودەیان دەدایەوە کە ئەو کۆدەنگە خوێنگەرمە لە میانەی گەشتەکەیاندا دەیانبیژا تاوەکو کۆنەکان بسڕنەوەو ڕۆژێکی نوێ بخەنەڕێ"[1].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل 236 – 237.

## ماوەی پوچەڵکردنەوە

بانگهێشتی بابی لەدوای کۆنگرەی "بهدەشت" بە ماوەیەکدا تێپەڕی کە ناونرا "ماوەی پوچەڵکردنەوە"، ئەو ماوەیە بو کە باب شەریعەتی کۆنی پوچەڵکردەوە لە کاتێکدا کە هێشتا شەریعەتی نوێی نەهێنابو. وادیارە کە هەندێ لە بابیەکان ئەو ماوەیان قۆزتەوەو بەشێوەیەکی ناباش شوێن ئارەزوەکانیان کەوتن. کتێبی "مطالع الأنوار" سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت: "... لە کاتی سەفەرکردنیان بۆ مازندەران هەندێ لە شوێنکەوتوان دەیانویست بە خراپی ئەو ئازادیە بەکاربێنن کە لە ئەنجامی پوچەڵکردنەوەی شەریعەتی کۆن دروستبوە، پێیانوابو کە ئیتر پاکیزە پەچەی لابردوە ئەمە ئاماژەیەکە بۆ بەزاندنی سنورەکانی ڕەوشتەو نیشانەیەکە بۆ تێرکردنی ئارەزوەکان. سنوربەزاندنی ئەو چەند کەسەش بوە هۆی توڕەبونی "مەولا"و جیابونەوەو پەرتەوازەبونیان. چونکە لە گوندی "نیالا" تاقیکردنەوەیەکی توند کران و توشی زیانێکی گەورەبون لەلایەن

دوژمنانیانەوە، ئەم پەرتەوازەبونە لە ئەنجامی زیادەڕەوی ئەو چەند کەسە نابەرپرسە بو"[2].

نوسەری کتێبی "مفتاح باب الابواب" بۆمان دەگێڕێتەوە کە چی لە گوندی "نیالا" ڕویدا، دەڵێت: "قورەتلعەین کاتێك کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا گەشتە ئەو گوندە لەگەڵ قدوسدا بە مەبەستی حەوانەوە لە ماندویەتی گەشتەکەیان چونە حەمامەوە". خەلکی گوندەکەش پێیانزانین کە لە چ دۆخێکدان، بۆیە یەك یەك‌و پۆل پۆل ڕیزیان بەست‌و هێرشیانکردە سەریان، پەرتەوازەیانکردن‌و چەند کەسێکیان لێ کوشتن‌و هەندێکی تریشیان لێ بریندار کردن، پارەکانیان بردن‌و کەوتاڵەکانیان دزین، پاشان بە ڕوتی‌و پێخاوسی بەرەڵلایانکردن..."[1].

ئەم چیرۆکە کە لە کتێبی "مفتاح باب الابواب"ـدا هاتوە بابی‌و بەهائییەکان بە تەواوی نکوڵی لێدەکەن‌و بە یەکێك لە درۆکانی نەیارەکانیان دایدەنێن. بەڕێز کامل عەباس یش کە سکرتێری پێشوی ئەنجومەنی بەهائیەکانە لە بەغدا لەم بارەوە کۆمێنتی داو وتی: قورەتلعەین جێی متمانەی زانایان بو وە گەواهیان بە پاکیزەیی ئەو ئەدا لە تەواوی قۆناغەکانی ژیانی دا، ئەوەشی کە لە کتێبی "مفتاح باب الابواب"ـدا هاتوە درۆو هەڵبەستنە[2].

---

[2] محەمەد مەهدی خان، سەرچاوەی پێشو، ل 182.

[1] عبدالرزاق الحسني: "البابیون والبهائیون في حاضرهم وماضیهم"، صیدا- لبنان، 1957، ص 72.

[2] عبدالرزاق الحسني: "البابیون والبهائیون في حاضرهم وماضیهم"، صیدا- لبنان، 1957، ص 72.

نوسەری ئەم ڕستانە قسەی لەگەڵ بەڕێز کامل عەباسدا کردو لە بارەی "ماوەی پوچەڵکردنەوە"ـوە پرسی کە ئایا چ شتێکی تیا پوچەڵکراوەتەوە یان ئایا ڕێساکانی هاوسەرگیری‌و لێکجیابونەوەی گرتوەتەوە، لە وەڵامدا وتی: ئەو ماوەیە تەنها پوچەڵکردنەوەی ئەرکەکانی خواپەرستی گرتەوە وەك نوێژو ڕۆژو ئەو شتانە، بەڵام فێرکارییە ڕەوشتیەکان لەو ماوەیەدا هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نەهێنرا چونکە هەمو ئاینەکان لە ڕەوشتدا وەك یەك وایە بۆیە هیچ جیاوازییەك لە نێوان کۆن‌و نوێدا نییە.

ڕۆژهەڵاتناس "براون" باس لەوە دەکات کە لە ساڵی 1888ز لە میانەی گەشتێکیدا بۆ ئێران پیاوێکی ئازادیخوازی بینیوە کە سەر بە ڕێبازی بابی بوە، لە میانەی قسەکانیاندا کەوتونەتە سەر باسی قورەتلعەین‌و ئەو تاوانانەی کە نەیارانی دەیخەنە پاڵی کە گوایە پەیوەندییەکی ناشیاوی هەبود لەگەڵ قدوسدا، پیاوەکە بەرگری لێدەکات‌و دەڵێت: ئەوان قورەتلعەین بە ناپاکی تاوانبار دەکەن ئەمەش درۆیە چونکە ئەو کرۆکی پاکیزەیی یە، بەڵام ئەو تاوانەی کە دەیخەنە پاڵی ڕەنگە لە ماوەی پوچەڵکردنەوەدا ڕویدابێت‌و وەك هاوسەرێك تێکەڵی قدوسی کردبێت، بەڵام لەدوای هاتنی شەریعەتی نوێ خۆی‌و سەرجەم شوێنکەوتوان بە تەواوی پێیەوە پابەندبون[3].

---

(1) E. G. Brown (A Year Among the Persia) Cambridge 1927 p.571-572.

## چارەنوسی قورەتلعەین

لە 9ـی تەموزی ساڵی 1850زاینی باب لە تەبریز لەسێدارە درا بە پشت بەستن بە چەند فەتوایەك کە لەلایەن زانایانی ئەو شارەوە دەرچوە. کوشتنی باب شوێنکەوتوانی تورەکرد هەر بۆیە سوربون لەسەر ئەوەی تۆڵەی بسەننەوەو شا ناصر الدین تیرۆرکەن. لە 15ـی ئابی 1852ـداو لە کاتێکدا کە شا لە دەرەوەی کۆشکەکەی لەسەر شاخی شەمران لە سەوەزەلاندابو دوو پیاو بەرەو ڕوی ڕۆشتن کە یەکیان کاغەزێکی سکاڵای پێبو هەردوکیان هاواریان دەکرد "داماو داماو، یارمەتی یارمەتی"، کاتێك کە شا دەستی برد سکاڵاکە وەربگرێت ئەویتریان بەخێرا فیشەکێکی نا بە ڕانییەوە کە توشی پێکانێکی سوکی کرد، پاسەوانەکانی بەپەلە نیشتنە سەریان یەکیان لێ کوشتو ئەوی تریشیان بە برینداری گرت. ئەم هەوڵی تیرۆرکردنە سەرەتایەك بو بۆ دەستپێکردنی هەڵمەتێکی بەرفراوان کە سەرتاپای ئێرانی گرتەوە بۆ گەڕان بەشوێن بابییەکانداو پاشان کوشتنیان، زۆرێك بێتاوان بونە قوربانی بەهۆی تاوانبارکردنیان لەلایەن نەیارانیانەوە بەوەی کە ئەوان بابین.

ئەو دەمە تاران ئەشکەنجەو توندوتیژییەکی بێ شوماری بەخۆوە بینی کە پێکەوە حکومەت‌و خەڵکی تێیدا بەشداربون. دەوترێ ئەو بابیانەی کە لە تاران دەستگیرکران بەسەر سەرجەم چین‌و توێژەکاندا دابەشکراون، هەر چینەو بەشی خۆیی لە بابییەکان بردوەو پاشان بەنێو کوچەو کۆڵانەکاندا جمێنیان پێداون‌و سوکایەتیان پێکردون‌و ئەشکەنجەیانداون‌و پاشان کوشتونیان[1]. "سایکس" دەیگێڕێتەوە کە هەندێ لە بابییەکان بە تەور سەربڕاون، کاتێکیش کە پزیشکە فەرەنسیەکەی شا بەشەکەی خۆی لە بابی پێدەدرێت ڕازی نابێت قوربانیەکانی بە تەور پارچە پارچەبکات‌و بیانویان بۆ دەهێنێتەوەو دەڵێت: من بەهۆی پیشەکەمەوە بەشی خۆم خەڵکم پارچە پارچەکردوەو نامەوێت قوربانی نوێ بۆ لیستەکەم زیادبکەم[2].

قورەتلعەین یەکێ بو لەو کەسانەی دەستگیرکران وەلێ ئەو لەلای مەحمود خان کلانتەری پارێزگاری شاری تاران گلدرایەوە. ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە کە قورەتلعەین چاوی لەو دۆخە تیرۆکاریەی چواردەوری نەبو بەڵکو بەدرێژایی ئەو ماوەی کە لەماڵی پارێزگار دەستگیرکرابو بەردەوامبو لە مژدەدان بە بانگهێشتی بابی. ئەو بۆنەو کۆڕە ژنانەی دەقۆزتەوە کە لەو ماڵە سازدەکراو تێیدا وتارە سەرنجڕاکێشەکانی خۆیی دەبێژا. وادیارە بونی قورەتلعەین لەو ماڵە وەهای کرد لە ژنان بڕژێنە سەری تاکو ئەو ئافرەتە

[1] عبدالرزاق الحسني، سەرچاوەی پێشو، ل 33.

[2] Sir Percy Sykes (A History of Persia) London 1958 vol.2. p344.

بەناوبانگە ببیتن کە ناوی کەوتبوە سەر هەمو زبانێك. قورەتلعەینیش دڵی ئەو ژنانەی دەوروژاندو ئەو پێگە پچوکەی نیشان ئەدان کە پیاوە ئاینییە کۆنەکان بۆ ئافرەتیان داناوەو ئەوەی بۆ باس دەکردن کە چۆن ئەم ئاینە نوێیە پێگەی ئافرەتی بەرزکردوەتەوەو ئازادی خۆیی پێ بەخشیوە.

"صدر الأعظم" دوو زانای پیاوی نارد بۆلای قورەتلعەین، کە ئەوانیش مەلا محەمەد ئەندرمانی‌و مەلا عەلی کینی بون، تاکو تاقی بکەنەوەو ڕاپۆرتێك لەبارەی بیروباوەڕی ئاینی یەوە بنوسن هەتاکو لێپرسینەوەی شیاوی بەرامبەر بکەن. ئەم دوو پیاوە بە مەبەستی تاقیکردنەوەی حەوت دانیشتنیان لەگەڵدا بەست، ئەویش لە هەمو دانیشتنێکدا بە خوێنگەرمییەوە مشتومڕی لەگەڵ دەکردن‌و بۆی دەسەلماندن کە چۆن باب ئیمامی چاوەڕوانکراوە، ئەمان بەو جۆرە وەڵامیان ئەدایەوە کە ئیمامی چاوەڕوانکراو بەپێی سەرچاوە ئاینییەکان لە هەردوو شاری "جابلقا"و "جابرسا"ـوە سەرهەڵئەدات، ئەویش وەڵامی ئەدانەوەو دەیوت ئەوە شتێکی بێجێیەو نوسەرە درۆزنەکان هەڵیانبەستوەو ئەو دوو شارە بەهیچ شێوەیەك بونیان نییەو هیچ نین جگە لە ئەفسانەیەك کە شیاوی شێتەکانە، پاشان بەکاریگەرییەوە وتی: "ئەو بەڵگانەی کە ئێوە رەواجی بۆ دەکەن وەك قسەی منداڵێکی دەبەنگی نەفام وایە، تا کەی بەشوێن ئەم درۆو ئەفسانە شێتانەیەدا دەڕۆن، تا کەی سەرتان بەرز ناکەنەوە تاکو خۆری ڕاستی ببینن". مەلا عەلی بەم قسانە توڕەبو هەستایە سەرپێ‌و بە هاوڕێکەیی وت: "چ سودێك هەیە لە قسەو مشتومڕ

لەگەڵ کچە گومڕایەکدا!". پاشان چونەدەرو ڕاپۆرتێکیان نوسی تێیدا ئاماژەیان بەوەدا کە قورەتلعەین وەرگەڕاوەو گومڕابوەو ڕازی نەبوە تۆبەبکات بۆیە بە پشت بەستن بە ڕێساکانی قورئان شایەنی کوشتنە[1].

قسەکان لەبارەی چۆنیەتی کوشتنی قورەتلعەینەوە جیاوازن، هەندێکیان دەڵێن: خراوەتە نێو لولەی تۆپێکەوەو گوللە تۆپێکی پێوە تراوەو پارچە پارچەی کردوە[2]، هەندێکیشیان دەڵێن: قژی بە کلکی هێسترێکەوە بەستراوەو بەو شێوە هەتا دادگا ڕایکێشاوە لەوێش بڕیار دەرچوە بە زیندوی بیسوتێنن بەڵام حکومەت فەرمانی داوە سوتانەکەی دوابخرێت بۆ دوای مردن، بۆیە خنکاندویانە پاشان تەرمەکەی خراوەتە نێو ئاگرەوە[3]. ڕۆژهەڵاتناس "براون"یش لە زبانی کەسێکەوە دەیگێڕێتەوە کە گوێی لە مەحمود خان کلانتەر بوەو دەڵێت: شا قورەتلعەینی بانگکردوە بۆ کۆشکەکەی خۆی لە نیگارستانو داوای لێکردوە خۆی لە باب بشواتەوە بەڵام کاتێك کە قورەتلعەین ڕازی نەبوە شا فەرمانی داوە بخرێتە ئەو بیرەوە کە لە باخچەی کۆشکەکەیدایە، پاشان چوار بەردی گەورەیان بەسەردا فڕەداوەو بە خۆڵ سەریان ناوەتەوە[4]. بەڵام خاوەنی کتێبی "مطالع الأنوار" دەڵێت قورەتلعەینیان لە ماڵی پارێزگارەوە بردوە بۆ باخچەی ئیلخانە، ئەم باخچەیەش پێشتر بونی هەبوەو ئەوکات بەرامبەر

---

[1] محەمەد زەرەندی، سەرچاوەی پێشوو، ل 497 – 498.

[2] محمد باقر جلالي، "الحقائق الدينية في الرد على العقيدة البهائية" النجف، بێ بەروار، ل 24.

[3] محەمەد مەهدی خان، سەرچاوەی پێشوو، ل 183.

[4] E. G. Browne (op cit) p. 541-542.

بالوێزخانەی بەریتانیا بوە، لەوێش بە دەستەسڕێکی ئاوریشم خنکێنراوە کە قورەتلعەین بەدەستی خۆی داویەتی بە جەللادەکەی، پاشان خراوەتە نێو بیرێکەوە کە لەو نزیکانەدا هەلکەنراوە، دواتر سەری بە خۆڵ نراودتەوە[5].

[5] محەمەد زرندی، سەرچاوەی پێشو، 500 – 501.

## هەڵسەنگاندن

کاتێك کە سەرگوزەشتەی قورەتولعەین لە سەرەتای ژیانییەوە تا ساتەوەختی کوشتنی دەخوێنینەوە هەست دەکەین کە ئەو ئافرەتێکە وەك ئافرەتانی تر نییە، چونکە ئەو سەرباری ئەوەی کە لەرادە بەدەر جوان بوە لە هەمان کاتدا ئافرەتێکی یەجگار زیرەك بودو خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێزو زیاتێکی پەراو بوە، ئەو چوار خەسڵەتەش کەمجار لە یەك مرۆڤدا کۆبێتەوە، ئەو کە ئەو خەسڵەتانەی تیا کۆبۆتەوە توانیویەتی کاریکاتە خەلکی‌و بوەتە یەکێ لەو کەسانەی کە رێرەوی مێژو دەگۆرن.

"کۆنت دی گۆبینۆ" لە کتێبەکەیدا بە ناوی "ئاین‌و فەلسەفەکان لە ئاسیای ناوەراست"ـدا وەسفی دەکات، ئەو لە دوای کوشتنی قورەتلعەین بە ماوەیەکی کەم سەردانی ئێران دەکات، دەڵێت: "... زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا بینویانە یان گوێیان لێی بوە هەمیشە ئەوەم بۆ باس دەکەن کە ئەو سەرەرای ئەو ناوبانگەی کە هەیبوە

لە زانستناسیدا وتاربێژێکی لێهاتووبوەو گوێگرانی لەناخی دڵیانەوە هەستیان بە خرۆشان کردوەو بەسەرسامییەوە فرمێسکیان ڕشتوە"[1].

هەروەها خاوەنی کتێبی "مفتاح باب الابواب" پیاهەڵدانی بۆدەکات‌و دەڵێت: "ئەم ئافرەتە نمونەی جوانی‌و کەماڵ بو، کەسێکی دانسقەو میانڕەو بو، زبان پاراو و ڕەوانبێژ بو، وتە خۆش‌و قسە شیرین بو، چاونەترس‌و دلاوەر بو، هەڵبەستە فارسی‌و عەرەبییەکانی هەمو ئەدیبێك شەیدای خۆی دەکات، هەمو دانایەکی دڵبەند دەکرد، بەلام بەدبەختی‌و بێشەنسی لەناوی برد[2].

ئەوەی کە تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە ئەو زۆر ئارەزوی نوێکردنەوەی هەبوە لە بیروباوەڕدا، چونکە ئەو کاتێك دەچێتە سەر ڕێبازی شێخیەکان ئەوکات ڕێبازێکی نوێ دەبێت لەنێو شیعەدا، هەر ئەوەندەش کە گوێبیستی سەرهەڵدانی باب دەبێت دەستبەجێ بانگهێشتەکەی لەئامێز دەگرێت.

دەبینین هەر ئەوەندەش کە دەچێتە سەر ڕێبازی بابی داوای نوێکردنەوەی شەریعەت دەکات، جارێك لە کەربەللاو جارێکی تر لە کاظمیەو جارێکی تریش لە بەغدەشت، تا دواجار سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ڕاستە گەر بڵێین ئەگەر قورەتلعەین نەبوایە ئەوا مێژوی بانگهێشتی بابی بەو شێوە بەڕێوە نەدەچو.

[1] سەرچاوەی پێشو، ل 505.

[2] عەبدە محمدی خان، سەرچاوەی پێشو، ل 183 – 184.

هەندێ لە نەیاران هەوڵیاندا هۆکاری ئەو ئارەزووەی کە هەیبو بۆ نوێکردنەوەی شەریعەت بگێڕنەوە بۆ هاوسەرگیریە شکستەکەی نێوان خۆیو ئامۆزاکەی، چونکە بە بۆچونی ئەوان قورەتلعەین زۆر ڕقی لە مێردەکەی بوە بەو هۆیەش کەوا شەریعەتی ئیسلام مافی جیابونەوە بە ئافرەت نادات ئەوا ئەویش بەجۆرێکی خۆنەویست هەمیشە بەردو ئەو ڕێبازانە ڕۆشتوە کە چانسی ئەوەی پێ ئەدەن شەریعەت پوچەڵ بکاتەوە تاکو بەهەر جۆرێك بێت ڕزگاری بێت لە مێردە ڕقاویەکەی.

بەهەرحاڵ من پێموایە قورەتلعەین ئافرەتێکی بلیمەتەو لە سەردەمی شیاوی خۆیدا نەهاتوە، یان لانی کەم سەد ساڵ پێشی سەردەمی خۆی کەوتوە. چونکە ئەو گەر لە سەردەمی ئێستاماندا سەری هەڵبدایە، لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوی شارستانیدا، ئەوا پێگەیەکی تری دەبو، ڕەنگە مەزنترین ئافرەتی سەدەی بیستەم بوایە!



# هكذا قتلوا قرة العين

د. علي الوردي

بەهەرحاڵا من پێموایە قورەتلعەین ئافرەتێکی بلیمەتە و لە سەردەمی شیاوی خۆیدا نەهاتوە، بەڵان لانی کەم سەد ساڵ پێشی سەردەمی خۆی کەوتوە. چونکە ئەوگەر لە سەردەمی ئێستاماندا سەری هەڵبدایە، لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوی شارستانیدا، ئەوا پێگەیەکی تری دەبوو، ڕەنگە مەزنترین ئافرەتی سەدەی بیستەم بوایە!




